## مەوسیمی تەنهاییەکی تر

لێرە نیت ئەم شەوگارانەی چرکەکانی عومرم
بەدیار دووکەڵی جگەرەکەمەوە بەسەرئەبەم.
لێرە نەبووی گەنجێتیم بەکچە دیگۆلاسەکانی سەرجادە دۆڕاند.
لێرە نابیت ئەو رۆژەی کۆترە مەغرورەکانیش لە هەنگاوەکانی پیرێتیم
سڵ ناکەنەوە،
ئیدی زیندەگی..
وەکو کەرە ڕەشێکی گەڕۆڵ
ولاتە و زولات و شاخ بەشاخ و ئاسمان بە ئاسمان
بەدووی خۆمداکێش دەکەم، لە کوێرا بەرەلاکەم..
کە هەمیشە وەک سێبەری ئەو جەلادەی ڕۆژێک لە خەونیشا لێم غافڵ نابێت
بە دوامەوەیە.
دیسان نەفەسێکی تر لە جگەرەکەم وەرەیەم
ڕەنگە ئەم شەویان لەبری دووکەڵ
ڕۆحم لە کەپومەوە بەرزبێتەوە بەرەو حەوا
هاوڕی شاعیرەکەم دەڵی
بۆ دەبێت لە نوسینا وەک مریشک پەڕوپۆی ئاخ بدەینەوە
ئاخر ئەگەر وەک مریشک پەڕوپۆی ئاخ نەدەینەوە
پەڕوپۆی ئاخ دەمانخنکێنێت
بۆ تێناگەن لە سەلای منێک لە منالیەوە تەنهایی خواوەندمە
هەتاکو کەی بەدیار چاوەڕوانیتەوە
شیعری هیچوپوچ بنووسم
بە دیار غیابی تۆوە وەکو حوشتر دەم کەمە حەواو
قیافەی ڕەزیلمم خۆشبوێت،
من دەزانم لێرەش بیت تەنهایی  وەکو مانگ بە ئاسمانی شعور و ڕۆحمەوە دیارە
من دەزانم وەکو کەس ناژیمو
بە قەد مێروویەکیش زەوی نازم هەڵناگرێت
با لە تەنهایدا
کڕنووش بۆسێبەری ڕۆح لەبەرێک بەرین

ڕۆح لەبەرێک
موبتەلابێت بە کۆکردنەوەی وردە گەردە ڕژاوەکانی شەو.
سوژدە بۆ فلۆغیستێک بەرین (1)
- کەبەیانیان دەنگ وباسی ولأتی گوڵستان بڵاودەکاتەوە.
بچینە ڕکووعەوە بۆ ئاوێک
لە سەروسیمای بۆگەنمان
وەڕس نابێت
وەرە هەڵبێین
لە ئێوارانی پیاسەو
خۆشپرزەکردن بە ڕۆحەوە
لە گەڵم بە ئەی دۆست
ئەی پارچەیەک لە گومانەکانی من
لەگەڵم بە
بە سنگەخشکە تا دووا ئاسۆکانی بێبایەخکردنی ژیان بڕۆین
تادوا لوتکە بەختەوەری قیزەون کەین

بابقوچێنین لە بەنجدی پێکەنین و لە پێوەندەکانی
گریانو
لە زیندانەکانی
عەشقو
لە خۆماندووکردن بەیەکتریەوە.
پێت وانەبوو چیتر..
گریانم بە پێکەنینەکانت نایەت،
ئەو شەوانەی کە نوزەنوز لە کونجێکدا
گوڵدانەکانم لەیەک دەتۆراندوو
وێنەی ناو ئەلبومەکەمم ئەیان بەشەڕ
لەوێ نەبوویت
ئەگین پێکەنینت بەگریانەکانمەهات
لێرە نابیت
گەنجێتیم سەراسیمە دەبێت
لە مەوسیمێکی تری
تەنهایدا......

## کرنوشەکانی من بۆ ژن

ئەی دوولبەر
بە کڵاوخودەی چ ئیمپراتۆرێکی فاڵبازەوە
ئاوقەبووی بە دەردم
تێکەڵ بەوکۆڵانە سیحراویانە بووی
کە ئولفەتیان بە گڕووگاڵەکانمەوە وەکو تەلیسم هەڵگرتبوو.
ئەی یار
تۆ بە پرچت قامچی شەرمەزاردەکەیت.
ئەی یار..................
بە بەژن سێدارە دەخەیتە مەراقەوەو
بەسینەت سەنگەردە گرێنی ئەی یار.
ئەی دۆست وەک پەڕەی گوڵ ئەستێرەکانی  پیاوەتیمت
هەڵوەراند بە حیلەت.
تۆ لە نوتفەی چ خوایەکی  جادوبازی روکایت؟
لە داوێنی  چ چەخماخەیەکەوە ڕژای؟
چ شوانکارێکی  پیرلە وەک فانۆسێکی  ئەبەدی
هەلیکرد

*　　　*　　　*　　　*

ئەو ئەژدیهایەی مۆخەکەم تامەکاو
دەنک دەنک
قەزوانی  پیاوەتیم ئەترو کێنی
مایلە بە سۆراغی خوێنم
ئەیەوێت سولالەکانم پرکات لە ژەهری ناکامی خۆی
دەیەوی بەشەربەتی عومرم
ئاوی  خەراباتەکەیبات.
دەخوازی بە درەختی ڕۆحم سێبەر بۆ لەشی  پیسی کات
ڕۆژێک پێی وتم
مەئوام نیە لە دەرەوەی  تۆ ئیزدیواجیەتمی  تیا بشارمەوە
کتێبێک شک جگە لە تۆ
هەراشیمی  تیابخوێنمەوە.
لەسەر تەختی تۆ زیاتر

شانۆیەک ناناسم
جادوەکانمی تیدا نمایشکەم
بۆ ئەوەی لەم کۆلانە ڕەنگاو ڕەنگی تۆیا
جوانترین دەموچاو بدۆزمەوە
وەرە حەلالم کە لە قیراج
وەرە تۆوی خۆت بە میعیارەکانم بتکێنە.
بە سەلیقەوە ڕێبەری غەریزەکانم بە.
ئەو ئەژدیهایەی لەنێو جۆلانەی منالیما ڕاکشاوە.
ئەسەفا ...........
مژ مژ
مەمکی دایکم دەمژێت.

* * * *

کرۆزانەوەی خوێنی منە لە خەونی گەلادا
کاتێک نایەوی هاوبەشی دەردی چۆلەکەکان بێت
ئەو نزاسووتاوانەی ئەستێرەکان ناچاردەکات
وەک لۆتیەک تەبەرِا لە تریفە و مانگ بکەن
لە ڕۆحی منەوە هەلئەکات
ئەو چەخماخانەی هەندی جار
خواکان لە بەهار تورەئەکەن
لە سنگی منەوە ئەکەونەوە
ئەکەونەوەو
تەپکی گولە بەرەژەکانە ئەچەرخێنن
ئەکەونەوەو
گولەگەنمەکان ئەترسێنن
ئەکەونەوەو
چەمەکان لە دەهشەتا ئەخنکێنن
ئەی جانەوەرێک لە وەرزی ناگەهان
ئەم نیگا ترساوانەم چۆن دەسوژێنیو
بارگاویم ئەکەی بە زەمەنێک
شوعلە شوعلە
بۆ ئافاتەکانی دەسوتێم
ئەی دۆست

ئەستێرەم جێبهێڵەو
وڵاتم لە سمی ئەسپەخەساوەکانت پاک کەرەوە
گەرەکم ئاواکەو
کوڕڵانم لە لوورەی گورگە هەراشەکانت
داشۆرە
خەیاڵم ئازادکەو
برۆ دەرەوە لە گوڵزاری خەونم
بە دووری تۆ لەنیگای پەپولەیەکدا هاوبەشی ژیان ئەکەم
بە کوژانەوەی تۆ لەم فەجرەیا
لە گمەی کۆترێکدا
دەنک دەنک
بەختیاری دەچنمەوە
بە ئاوابوونی تۆ
هامڕای ماسیەک
ڕۆدەچمە نێو قوڵایی حەقیقەتەکان
ئەی وەرزی پێنجەمی ساڵ ئەی یار
بڕوانە ژیانت
چ مەزاقی بە یادەوەریمان دەکات
ئەوکاتەی دەتەوێت
پشکۆیەک لە غروور لە هەناوما بگەشێنیتەوە
تەماشاکە
بەمەرگ چەندگۆڕستان خەبەردەکەیتەوەو
چەندین پێغەمبەری عاشق دەگریەنیت
تەماشا................

* * * *

تۆیەک ئەمێستا
لە دەرەوەی زیندەگیم
بە نیگای بەدەوە لە ئافاتەکانم دەڕوانیت
چ هەوەسێت دەتخاتەکرووژان
من مەحاڵە ئەودەرگایە بدۆزمەوە
نا هەرگیز.............
لەدووی قەترەڕژاوەکانی داوێنم دەگەڕێم

عەودالّی ئەو خەندە مەخجولانەم
منالّیمیان پی دەسخەڕۆکرد
وەکو دێوانەیەکی لەش پیس
بێزارم لە شکۆفەی نازناز
ڕێحانەکان پێشێل دەکەم
گرنگ نیە لام لاولاو
چەند جۆر ئاوازی چۆلەکەی لەبەرە
وەک جەنگاوەرێکی ترسنۆک
سەنگەرەکەم بەجی دەهێلّم ودەڕۆم
دەڕۆم ئەوگەردانە کۆدەکەمەوە
کە ڕازی نەبوون منالّیم پی ئاسودەکەن
دەچم جەنگەکان بەسەردەکەمەوە
لەوی تەرمێک بۆگەنی کردووە
شتی سەیری لی دەگێڕنەوە
قەرەچێکی ئالودە بەتەنهایی ووتی
بەڕێکەوت ئەم جەنگەلّەم ناسی
ئەو هەمیشەبە لەتێک ئاوێنەی
ش ک ا وە وە
قاقا بە برینەکانم پێدەکەنێت
ژنێک کە لە دووی تەرمی دەستگیرانەکەی عەودالّ بوو
وتی
بڕوام وایە شەهید نامرێت
نا......هەرگیز
ئەو هەمیشە ئەو نامە نهێنیانە دەخوێنێتەوەو
نای پەرژێتە سەرفوارەی برینی ،
ئیدی دلّنیام.. شەهید نامرێت
نا......هەرگیز
منالّێک کە هەمیشە لەوێڕاو
لە تۆپانی ئەگەڕاو
وتی
بۆ یەکەم جار ئەوگۆلّێکی ئالّتوونی تێکردم
ئەوکە دەگریا

منی دەخستە پێکەنین
ئەو برینەکانی وەکومانگ
بە تەویڵیەوە دەدرەوشێتەوە
لە دورەوە بەرلەوەی  لە دەرگی یەکەم نزیک ببمەوە
بینیم پۆلێک ڕیشۆڵەی بە باوەشەوەبوو
خوێنی  ئەیان
گەرەکی بو بمدوێنێت
ئارەزولی  دیدارم نەبوو
لەبوچگەنی  برینەکانم هەڵەهات
دەمویست وەچە لەخوێنی برینەکانم بخەمەوە
بەر لەوەی  مردن بکری بگرم
برینەکانمی  چورپەبرکرد
لە عەشق
لە ژیان
لە حەنان

* * * *

تۆیەک ئەمێستا
بۆڵ.........بۆل
بەرسیلەی  بەرائەتم هەڕاجدەکەیت
چ حوزنێک ئەت خاتە گلوژان
ئەی یار..........
چ حوزنێک ئەتخاتە گلوژان
بەهانەکانی  تۆ وایانکرد
کۆترەکان باوەڕ بەموعجیزەکانم نەکەن
ئەو سیحرە ئەفسوناویەی لەڕۆحتەوە
لە دورترین نیشتیمان
لەسەر بەرزترین لوتکە
لە قوڵایی کەوندا دەمهێنیتە سەرچۆک
وایکرد ئەستێرەکان
بۆ هەژاریم بسوتێن
ببمە بنێشتە خۆشەی سەرزاری زریانو
مێزی سەرخۆشەکانی  بەهەشتم پیبرازێن نەوە

دورنیە ئەوەندەی  ئێمە لەجیاوازیەک دەگەڕێین
جیاوازیک خۆبەخۆ وجودی  هەبێت.
ڕەنگە شەڕە خوێناویەکانی  ئێمە
بە لەیەکترازانی  ئەو هەمووە جومگە دەرکراوانە
 لە زێدی حەقیقی خۆیان وابکات
زیلزال بکەوێتەوە.
ئاوەکان تورەدەکەن و شەپۆل دەمانبا......
ئاسمان شێت دەکاو چەخماخە دەمان کوژێت
شاخەکانمان لێ هاردەکاو
بورکان دەکەوێتەوە
نا هەرگیز دوورنیە من و تۆ
جیاوازیمان نەبێت,
ئەگینا بەتەنهایی ناڵێین
سوکایەتی کردن  بەژیان
بە بەهرەکانی  ووجود.
من دوودڵنیم لەوەی
قەبیلەیەکی کەم ئەندام بۆ بێدەربەستی  خوداوەند
لە نزا سوتاوەکانمان بەم تاعونە نەمرین
نا.....هەرگیز
خانەگومانم لەوەی کەهەمیشە
لە دەرەوەی ناجۆریەکانی فیزیک بژین
وەرە ئەی بەدترین یار
وێڵ بین عەودالی  ئەو مافە ئەزەلی‌یە بین
خواوەند لەئێمەی کێشایەوەو
بەخشی‌یە درەختەکان
دڵی  ڕەنجاندین و ئاوەکانی  پێ ئاسودەکرد.
ئۆرجازم کزانەوەی برینی کەرت بونمانە
لە ئەزەلەوە
هەڵپەکانی  من وایکرد
چیتر پەپولەیەکت پێ ماڵی  نەکری
سمکۆڵانەکانی تۆ وای کرد
باخەکان لە هەواڵم نەپرسنەوە

وەرە لەدوی جیاوازی مەگەڕی
نا.......هەرگیز
دوای ئەو نورە ئەبەدیە بکەوە
ڕەنگە شتێک لە تەفرو تونابونمان بزانێت
قەدەری ترازانی تەزووە بەرینەکانمان
وەک کزەی ئەو برینە هەڵگرە
تا ئەبەدیەت مەحروممان دەکات
لە هاوڕێیەتی نەورەس ونێرگز و ئەستێران
بێبەریمان دەکات لە شەپۆلی دەریاو
لە نهێنی شەوو
لە بەرینی ئاسمان،
ئەو شمشێرانەی شتێک لە جیاوازی ناڵێن
بۆ باخچەکان جێهێڵە
بۆ ئەو بەردانەی تەوازنی کەونیان لەئەستۆیە
بەدوری تۆ یاریکردنی من
لە یاریکردنی ئەوسای مناڵی خواکان دەچێت
دەتوانم ڕۆژێک نەمرم
مردنی خۆم لە غەمزەیەکی تۆدا بشارمەوەو
ئەبەدیەت مسۆگەر کەم
دەتوانیت ڕۆژێک نەژیت
ژیانی خۆت بەشەرەفمەوەگرێ بەیتو
بچیتە ڕۆحی خواوەندەوە
لەوێوە بپرسی ئەمەیە جیاوازی
ئەی ئەو تارماییەی لەهەناوما خولود مومارەسە دەکەیت
ڕۆحی من بەو ئاسمانەوە سەمای ئەکرد
سەمای دەکردوو
لەقلەقەکان شاگەشکە ئەبوون
سەمایەک بوو نەهەنگەکان
دەست نوێژیان لەشەرما ئەشکا
بەڵام قودرەتی تۆ
لەوە گەورەتربوو ئەستێرەیەک
لەو فەزا برینەدا چاو بکەم

مەخابن شەوە زە نگی  تۆ
لەوە فراوانتربوو دواستونەکانی  بەختیاریم
هەڵگرمەوەو
وەکو ملوانکە لەملیکەم
تا ئەوپەڕی  تاریکستان دوامەنزڵگای  ڕوناکیم دەپشکنی
زەنگیانەیەکم نەدەدۆزیەوە
حیشمەتێکی تۆی تیا نەبێت
کە دەچوومە نێو باخچەکان
لەو سەری  ئاوە کانەوە
سەرم دەردەهێنا و بەبۆن دەکەوتم
بۆنی  ئەو ڕۆژە شوومانەی برینە کانمان دەکزایەوەو

دەگریاین وپێدەکەنین
پێدەکەنین و دەگریاین
وەرە ئەی یار.............
بۆن بە برینەکانمەوە بکەو
پێبکەنە................
وەرە زامەکانت بۆن بکەم و بگریم
وەرە پێبکەنین پێکەوە
وەرە.........
وەرە بەیەکەوە بگرین

2001/7/16

پاریس

## دیوی دووەمی بێدەنگی

هەمیشەبۆئەو...
بۆ پەرِەندەیەکی بێسۆراخ

شیفۆنێک لە کەتانی رِۆحت
بە نیگاکانمەوە هەڵواسەو
وەک دێوانەیەکی بەئەمەک
ویڵم کە،
ویڵی مسووی خەنجێری باپیران..
عەودالی ئەوخوێنە رِژاوانەم کە
کە دوودڵ بووین لەوەی
خوێنی داوێنی کچە مەخجولەکانمان بێت
یان برا خائینەکانمان بێت،
بەرەڵام کە
با دۆستێک لە قەسوەتی شەوو،
دوژمنێک لەدیوی دووەمی باران بخوازم.
ئاخر خەندەکانی تۆ
هەرچەندە ئەفسوناوی بن،
توانای شیرین کردنی بەرسیلەیەکی
دڵ شکاویان نیە.
ئیدی لێرەوەو
لەگەڵ کەرنەڤاڵی تەرمەکانداو
هاوشانی سەربووردەی سێدارەدڵ رِەقەکانو
ئاوێنە بێبارەکاندا ویڵم کە
ویڵم کە....
گرنگ نیەخوێنی حەرفەکانم
لەسەر کاغەزی پاقلەفرۆشەکانی
سبەینی جێ بمێنێت.
نائومێدی وڵاتێک نییە،
سنوری وشەیاخی یەکانم،
پێوەندبکات.
من گەلێک جار نائومێدانە باڵدەگرمو

هیوای گەورە گەورە
دەمخەنە خوار
هەندێک جار
مانایەک شک نابەم
بەرائەتی بەفرو گیای پێ لەیەکتری
جیاکەمەوە.
خیانەتی خوا و شەیتانی تیا ساغ بکەمەوە
خوێنی داوێنی
کچۆڵەیەکی شەرمنو
شەهیدێکی کاڵ فامی تیابخوێنمەوە.
بەلام ئەوبایەی کە لەوێوە هەڵدەکات
ئەو لاپەڕانە هەڵدەداتەوە کە ئێمە نەمانخوێندۆتەوە.
ئەوئەرخەوانە دڵساردانە خەبەردەکاتەوە
کە هەرگیز نەماندیون
دوائایەتەکانی سێبەر
بەسەر باخەکاندا
پەرشەکاتەوە،
ئیدی وەک مەلەوانێکی جادووباز
خۆ لەقولایی ماناکان دەبوێرین
وەک ڕاوچی یەکی خەوالوو
خەو بەو نێچیرانەوە دەبینین
کە بێچووی وەرزێکی دیکەن
لە قولایی مندا
دەتوانی ئەو پەڕەسێلکە یاخی یانەی گومانڕاوکەی
وەکو فەیلەسوفێکی بەدمەست
چاودێری دیوی دووەمی ژیان دەکەن
ڕۆژێکم بیرنەماوە
خەندەیەکی ترسنۆکم لەفەقیانەی دایکما
بۆ برازۆڵەکانی دیکەم جێهێشتبێت،
ئەوفانۆسانەی
هێور هێوری دەسوتێن
بە پلێتەی عومری من بەرپێی درەختەکان

ڕۆشن دەکەنەوە
تیشک لەچاوانی من قەرزدەکەنو
گەروی شەبەنگەکانی بەیانی پی تەڕدەکەن
❊ ❊ ❊ ❊
چەند خۆشەبێ باوەڕی بەئایینەکان
چ لەزەتێکە
مەزاق کردن بەموعجیزەکان
ئاسودەم بەڕژانی
خوێنی ئەوراوچی یانەی
بەکۆڵانەکانداتی دەپەڕینو
خوێنی نێچیرەکانی دیکەیان نەدەدی
پێت وانی یەگلێنەکانی من
ئاسمانی دنیایەکی گەورەتر نەبێت
لەژیانو
مردنێکی
گەورەتر
من گومانم نیە
کوخە دوورەدەستەکانی تۆ
دواعەرشی خوایانە نەبن
ئاخرمن باوەڕ بەعەرشێک ناهێنم
میزووگوی پیانەکەینو
خۆشمانی لەسەرجوت نەکەین
باوەڕ بەموعجیزەیەک ناهێنم
گورگەکانی لەزەتم
بەسۆزی شمشاڵی بۆماڵی نەکات.
❊ ❊ ❊ ❊
هەموو بەدبەختیەکانی من
لەوسیاساڵەوە ڕژان
یەقینێکم شک نەدەبرد
قومرییەکی گرینۆکی بەربارانی
پێ ژیرکەمەوە،
ئەوڕۆژگارانەی ....

باوکم چەقۆی لێ هەڵدەکێشامو
ڕوتی دەکردمەوە
لەپەڕی ناسکی ئەوکۆترەشینکانەی
لەسەر پێڵوەکانم
ئاترامانە دەڕوان
هێلکەی ئەوچۆلەکە بەهارییانەی
لەگیرفانەکانمدا دەدۆزییەوە
هەڵم گرتبوون
ژیانێکی زەڕنەقوتانەم بۆهەڵبێنن
لەعەشق
ئەوی ڕۆژی گران بوو
سەرەداوی ئەوچیرۆکانە بدۆزینەوە
کە ئەمیرەکانیان لەکۆشک دەردەپەڕاندو
دایەنە حیلەبازەکانیان
تیا دەگرتە شوشە
من کەلەم ئێوارەیە
نزیک دەبمەوە
ترسێکی قوڵ وەکو یاقوت لەهەناوما دەبریسکێتەوە
ئەوەی ڕۆژێک نزای ئێوارەی نەهێنابێتە دەنگ
لە مردنی خواوەند ناگات،
من دیوی دووەمم شوشەیە
بە بێدەنگی ئەو مەخلوقاتانە دەشکێت
کەنەبزی دڵی پەپولەیەکو
عارەفەیەکی قەموور
لەیەکتر جیا ناکەنەوە
ئەوڕۆژەی دەشکێم مناڵێک پارچەکانم دەگرێتە خۆرو
ڕەنگێکم تێدا زیندودەکاتەوەو
ڕەگەزێکی نەسرەوتم تێدا دەکوژێت.
ئەو ڕۆژەی هارە دەکەمە بەرپێم
کێ بەختەوەردەبێت
کچۆڵەیەک
وێنەی دەستگیرانەکەیم تێدا

هەڵدەگریتەوەو
مەملەکەتێکی  نە دۆزراوەم تێدا فەرامۆش دەکات
ئەوزەمەنەی
فرەی باڵی پەپولەیەک
خشپەی  هەڵکێشانی شمشێرێک لەکێلان
وردوخاشم دەکەن.
دیوی  یەکەمم هێندەی  رو ڕاوێنی
دوو شەپۆل بەدووی گزنگێکی یاخیدا
لەدیوە بێوەیەکەی  دووەمم
دووره
کە ئەو پارچەیەکە لەو زرنگە ناسازانەی
گەلا  گەلا
خەونی سەوز
باوەش باوەش
گۆرانی ئەوسەردەمانەی
لەگەڵ عەشقاخۆمان دەکوشت
بەرچاک بەرچاک
نێرگزی بێ بەری لە ڕەونەقی  دیوان
لەئەسیلەتمان دەتەکێنی
وردوخاش دەبمو
خەونی کوڕە تاقانەکەی سوڵتان نازرێنم
دەبم بەتۆزو
ئەمیرەیەکی  قژزەرد ڕاناچڵەکێنم
دەکەومەژێرپێی
ئەوکوڕ وکچە بەدمەستانەی
بێ منەت
لەساقیو
لەپێکو
بادەکان
دانس دەکەن وقاچی کەسیان بریندار ناکەم
بە هۆقە لەڕەوزەکانا هەڵدەدریێمەوەو
منالێک ناسڵەمێنمەوە

گەر هێندە خامۆشانە بمرم
بەچی دەچێت
تەفسیرکردنی ناجۆرییەکانی وجودم
لەکاتی مەستیا.
بەچی دەچێت
بەخشوعەوە وەستان لەم تەقسا
گەرمردنم ڕێڕەوی مێروویەکی بێدەربەست نەگۆڕێت
بۆباکم لە
ڕەشەباو
شمشێرو
شەپۆلەکان بێت.
بابێ باک بم
لەبێباکی ماسی لەتۆفان
لەئەندێشەی کۆترلەزستان
لەدوودڵی یەقین لەخوولقان
گەرمن زرنگەیەک لەم ئاوانەی کەونەیانە خەمەوە
وەک زرینگەی
خرخاڵ وبازنگی یار
وەک دەخیلەی منالانی ڕۆژی جەژنو
دەنگی ئەوسەر و کلاوەی
وا لەگەردنی خنجێری بەرپشتێنی ئاغایەکداو
زرینگەی دی
بابێ باک بم لەشکانی دیوی دووەمی بێوەییم
* * * *
ئیدی بێدەنگ
لەنێو ئاوێنە درۆزنەکانداو
لەپانتایی بەحرە مەنەکانداو
لەنێوقولایی
سەراب وناواخنی سێبەرەکانماندا دێینەدەری
دیوی یەکەمم
کە هەمیشە لە بێدەنگی‌مان دەگەڕێت
مومارەسەدەکەین

هاوڕی
ئەی دۆستی بێدەنگی یەکانی من

ئەوەی منی کوشت وپەنجەکانی یەک یەک
لستنەوە
بێدەنگیە شەرورەکانی تۆ بوو نەک
شمشێرو
ڕەشەباو
چەخماخەو
ئا...و...ه...ک...ا...ن

زستانی /1999
فرنسا/لیۆن

# ئـێواره و مــن و عەشــق

ئێواره له منالیمدەکاو
بی سلاو خۆیدەکا بەمالاو
گیرفانێک پەژارەم ڕۆدەکاته بەردەم
ئێواره دێ ودلم لەمەنجەنیقێکی سارد دەکات
ئەمەوێت نامەیەک بۆ دۆستێک بنوسم
چاوم بەرایی نادات
ئارەزودەکەم دوژمنێک بهێنمه ژیانمەوه
بی سەلیقەیی نایەلێت
نازانم جەنگی من وئێواران
ئەگەرێتەوه بۆچەند قەرن لەمەوپێش
تی ناگەم ئاشتی من وتەنهایی
دەگەرێتەوه بۆ چەندمەرگ لەمەو پێش
ئێواره وەکو مارێکی رەش
خۆی دەکات بەکەلێنێک لەو هەزاران کەلێنه
کەن دڕکراوانەی دل ماو
تەنهایم دەووروژێنی
دەنگێک له هەوادا پێم دەلێت
ئێوارەت گلاو
دەنگێک که غەریب نییه بەلامەوه
پێم دەلێت
ئێوارەیەکی ناگەهان بەریته سەر
ئاااى ...خوایەگیان
سەدەیەکه ئەمەوێ
وەک ژنێکی ئاوس
ئەم پەژارەیەم لێبێتەوه
ئەم زۆلەی دەهرێکه ڕژاوەته ڕۆح مەوه بێتەزمان
ئێواره سەرم بەپێکێ ژەهرەوه دەخواو
نازانم هانا بۆکام یەکێک لەو دۆستانەم بەرم
که هێشتا دلنیانیم پێیان وابێت
هەربەڕاست عەزابەکانم بۆنی دوکەلی جگەرەکانی

ئەوانی لێدێت
لارە لار
دەست دەنێم بە دەرگای ته نهاییەوە و کێلونی
عەزاب دەترا زێنم
سەیرەکەم زەرنەقوتەی جوان جوانی عشق
بەدووی سێبەرەکە مامله قوتەیانە
هەنگاوێک
لەولای دڵەساردەکەی
(ناتاشا) وە
چەند پێکەنینێکی ئێکس پایەر
دەدۆز مەوە
کەمێژوی لە دایک بونیان
دەگەڕێتەوە بۆوشکە ساڵەکانی
(مولوز)1

دڵم تەنگ دەبیی و پێکە نێنێک دڵم دا دەخورپێنی
پێکەنینێکی عاجز دەمهێنێتە سەما
سەمایەک
هەر دە لێی دوای سەمای گەلایەکە
بەڕووی مەرگێکی ئەزەلیا......
دەمەوێت مشتێک لەو پێکە نینە ئێکس پایەرانەی
ژورسەری
(ناتاشا)
گرد کەمەوە،
ئەفسوس ئەوی رۆژێک
ئەو خەوی بە عەشقە کەیەوە دەبینی.
جریوەکانی نێو ڕۆحم دەتۆرێن
ترسێک وەک خۆفی گوناهبارێکی جوان
دەم هێنێتە لەرزە
لێوە لە رزێمە و پەنجەکانم لەشەرما عارە قەدەکەن
تەوێڵم گەرم دەبێو
منالێم دێتە زمان

بمبووره لەخەوم کردیت
لە دوورەوە هاتووم
بۆ ئەوەی پێت بڵێم
لە وشکە ساڵەکانی
(مولوزەوە)
چەند بینی لەپێکەنینەکانم
لەنێو ئەگریجە عەیارەکانی تۆدا خۆ یان حەشارداوە.
با هێندە لە خۆیانم بێبەری نەکەن
خێرت ناگات......
هەروابە ڕێکەوت/
نا بەڕێکەوت
ڕێم نەکەوتە کۆشکە ئەڵماسیەکەتەوە ،
عەیامێکە عەوداڵی دۆزینەوەی تەنها خەندەیەکی عەجولم
کە ئاشنایانکردم بەتەنها ئێوارەیەکی تۆ.........
لەو ئێوارەیەوە
هەمو ڕۆژێک ئێوارە بێ
سڵاو
بێ پێکەنین
بێ خەندە
ئەم گەڕێنێتەوە ماڵێ
عاجز مەبە لە خەوم کردی
بمبووره
بمبووره بە تاڵە مووە سپییەکانی ڕیشم
نا... بمبووره
بە نوێژەکانی مام ۆسۆفی لە مزگەوت....
بمبەخشە بەئێوارەکانی مەولودی ماڵی خۆتان
ئاخر ئەگەر نەمبوری
هێندە عاجز دەبم ڕەنگە بۆهەتا هەتایە
لەگەڵ ئێوارەو
خەندەو
ماچەکانا
ئاشت نە بمەوە،

بەردەوام دەبمو
وەک دێوانەیەکی بێوەی دەلالێمەوە
وەک تکە ئاورنگێک دەرژێمە بەرپێی (ناتاشا)
بەردەوام دە بمو زمانم گۆناکات زیاتر بلێم.
ئا ا ا ا اخر من هەندێ جار
بەهۆی زۆر بلێییمەوە مانگ دەگیرێو
ژیان دەخەمە (مەترسیەوە) 2
زۆر بلێمو
(ناتاشا) باوێشک دەیات
چاوانی بە غرورێکەوە هەڵ دەگلۆفێو
وەک چەتەک وا دەزانێت بۆتالانکردنی هاتووم.
پێیوایە
وەک هەموو شەوانی تر بەسەرخۆشی بەسەر ئەم گەرەکەدا کەوتووم
وا دەزانێت گەردن ئازادی
ئەو تەنها ماچە هەتێوەی لێدەکەم
کە لەسەر لێومەوە
وەک ئەستێرە دەدرەوشێتەوە.
ئەمەوی تا مەزرۆیکەم بە قسە
ئەمەوی بزانێت من تەنها بەرسیلەیەکی سرکوکاڵ بووم
لەچاوەروانی ئەودا هێندە گەییم
دڵی سەرخۆشێکی ئێوارە م پێ رازی نەکرا
لەبەر پێی رێبوارەکانا هەڵمگرێتەوە
زۆر دەڵێم پێکەنینم بەگوتەی کوتاڵفرۆشە ژنانیەکە دەهات
کە هەمیشە دەیگوت زۆرگوتن لە قورئان‌دا خۆشە
نا ا ا ا عەزیزم .......
زۆرگوتن لەتەنهایدا خۆشەو
ئەوکاتەی (ناتاشا) دەرەنجیو
هەرگیزاو هەرگیز ئاشت نابێتەوە
بەڵام چ گووناهێکم هەیە
ئێوارە لە منالێم دەکاو
بەدەم وەرین پەلەمووسەکات
تەماشاکەن چەند بێ منەتە ژیانو

چەند بێ دەربەستە ئێوارەو
چ بەڵایەکە تەنهایی
تەماشاکەن.........

200/1/23
ئەمستردام

## سێبەرەکانی ڕۆح لەسەر سیلەی کۆڵان

ببوره له یادم کردی
ئەی سەرێک قانگ دراو به گومانو
ماندوو لەمەعرەکەی هەزارەها یەقینی پوو چەڵو
عەقیدەو باوەڕی دۆڕاو،
بمبورن
لەیادم کردن
ئەی ئیحساسێک ناسکتر لەقەتره ئاورنگێکو
شەفافتر لەدڵی سووری گێلاسێک ،
عەیامێکە قیبلەی شیعرم لێ ونبووە
بۆئەوەی له جێژوانێکی مەستانەدا
بیتانهێنمەوە
سەر برَینێکی دێکەی دێوانمو
وەکوو خوێن لەدەمی پێنوسەکەمەوە
بڕژێن
عومرێکە هەر بەڕاست عومرێکە ماندووی پێکەوە مردنێکی تازەم
مردنێک
دلی بەرد بکات به ئاوو
نەزیفی ئەم عەشقە ڕابگرێت
مردنێکی تازە
وەک ئەوەی هەموومان پێکەوە
شەرێک به ئیزرائیل بفرۆشین
بمبوورن .........
بمبەخشن به ئاو
به چلە ڕێحانەیەکی سەرخۆشی
ئێوارانی کەولۆسم ببەخشن
بمکەن بەخاتری دواچرکەکانی ئۆرجازم
نابینن وەک زەرنەقوتەیەکی خوساو به تەنهایی
ئەپارێمەوە لەبەفر.........،
وەک کۆترێک
گمه گم

بۆمشتێک ڕۆشنایی دەکرۆزێمەوە
وەک خانەقای سۆفیلکەکانە جیهانم
هەزار جەزبە لەچرکەیەکدا بەردەبێتە ڕۆحمو
ئارەزوی فڕینێک لێمەیات
فڕینێک
لەڕوناکیم بدزێتو
لەنێو تەپوتۆزی بێباوەڕیدا ونمکات
فڕینێک
نەڕۆح بم دۆزێتەوەو
نەشیعر هەڵی بێنی لەکوێم
تاچیتر جێپێکانی دڵمان بۆهەتا هەتایە بزرکەینو
ڕێگە نەبەینەوە سەری

* * * *

لەسیلەی ئەو کۆڵانەیا
ڕۆحم دەبێتە سێبەر
سبەی شەو
سبەی شەو
لێم ڕونە مانگ ئاوادەبێت
تاکوتەرا هەندێک ماڵ
تا درەنگانێک بەدیار تەنهاییەوە فانۆسەکانی غەریزەیان
دەسوتی ....،

تادرەنگانی
نمەی بارانەکانی سبەی شەو
بەسەر چڵی درەختەکانەوە نوێژ دەکەن
سبەی شەو
هاشەو هوشە لای بەفر
ماڵەکەم پڕدەکەن لەتۆپەڵە خەیاڵ
دڵم وەک قوماربازێکی ڕەزیل
ئەندێشەم لە مەراقەوە دەبات
سبەی شەو
لەتەنهایدا بیر لە خولقاندنی مەخلوقاتێکی عاشق دەکەمەوە
ئاخر خوا هێندە بێزاربوو لە تەنهایی

شوشەی قەهری شکاو
ئەم مەخلوقاتە نایفانەی
لەتەنهایی خۆی خەیاڵاند
تائەو هەموو کینە داوەشاوانەی خۆی
لەئێمەیا ویناکات
دوور نییە ئێمە تەنها خەیاڵی  خوایەک نەبین
لەبێکاریدا بەم دونیا سەیرەمان نەشوبهێنی
کێ دەڵی  ئێمە ئەفسانەیەکی  ترسناک نین و
خوایەک کورە تاقانەکەی  بە بەربەریەتی  ئێمە ناخلافێنی.
ڕەنگەتەنها خەونێکی  تاڵ بین
لە خەونە دەگمەنەکانی
حۆریەکانی  ئەوێکان
خەونێک کەهەزاران نەفرەت بەدوی  خۆیدا ڕادەکێشی
چەند نیگەران دەبم سبەی شەو لەسربان
ئەوکاتەی  گوێم لەتر پەی دڵی
(ناتاشا) دەبێت
تادرەنکانی  چاوەڕێی ئەستێرەیەکی  ئومێد دەکەم ڕەنگە هەڵبێت،
سبەی  شەو دەڕۆمە کۆلان
لەسەردیواری  ماڵەکان بە دەباشیرێکی سوور دەنووسم
ئەم شەویش نەهات
سەرخۆشێک کەهیچی  لێ  تێناگەم
سەر زەنشتم دەکات
بەژێر سێبەری  درەختەکانی گوماندا تێدەپەڕم و
فرمێسکی چۆلەکەکانی سبەی شەو
نەرم نەرم
تەڕم دەکەن
ببورە لەیادم کردی ئەی ڕۆح
لەسەر سیلەی کۆلان

2002/8/27
فەرەنسا. موولوز

# خــوا و مـــن

خودا وەک نالّبەندێکی بی قەرەچۆل
ئەسپەیالّ شۆڕەکانی غەریزەی نالّ کرد
من گاردیانێکی ڕەنگ بڕسکاوی ژێر باران بووم
دەم بینی ئەو باخەوانە قەموورەی بەئێرەدا ڕەت دەبوو
ئایەتی لە ئاو تەڕتری بەسەر سەمەری ئەو شمشێرانەدا
دەخوێندەوە
کە بە خوێنی حۆرییە ڕوتەڵەکانی ئاوی دەدان
هەندێک جار
لەژماردنی ئەو ئەستێرانە ماندوو دەبووم
کەوەکو لەهیبێکی زامدار لە ڕەچەڵەک هەلدەهاتن
بەلاّم ئەو وەک منالێکی قژ بڕی کەڕو لالّ
دەهات و یاری بەرە نگەبرۆنزییە کانیان دەکرد
جوان ترینیانی
بۆدەسکەلا ڕادەهێنا
تایەک یەک
ئەوئەستێرانەی دیکەی پێ قرچکات
کە مایلبوون لەسەر سنگم کەونێکی نوی بخولّقێنن.
پێکەوە بە لای مەلولی
گولە گێلاخەیەکەوە خەو دەیبردینەوە
من دەمپرسی گەر تۆ لەهەراسانی ئەم شەوگارانە بێئاگابیت
وەلاّمی پرسیارە بێ شومارەکانی ڕۆژگار بەمن نادرێتەوە
ئەو دەی پرسی
گەرتۆ لە زولّمەتی شەوە عاجزەکانمدا
مقالّی ئەندێشەیەک نەگەشێنیتەوە
ڕۆژگارەکانت لەچاکەکانیانم دەتەکێنن
من دەمگوت
وای ئێوارەیەکی چەند خۆشە بۆمردن
مادام تەوازنی ئەم ناجۆریانە لەگەلّم کۆنابنەوە
چ شەرمە زارییەکە
خۆخزاندنە ژێر سێبەری ئەم مووعجیزە ساردانەی تۆ

کەشتێک لەبارەی شەتەحاتی ئەم ئەندیشە ناسازانەی منەوە ناڵێین
دەم لە نەفەسی  ئەو جگەرەیە مەکێشەرەوە
کەلە دوکەڵکێشەکەیدا
ڕوتوقوتی  ئێمەی تیاین
دەزانم دەڵێی
ئەم جەنگە شەریفەی نێوانمان
دەرەنجام و فەشەلی  نیە
من سەر مەستانە ویڵی  ئێوارەیەکت بووم
کەتۆی  تێدا گەشاندمەوە
ئاگرێک لەڕۆحم جیا بویەوە
بڕوانە ئەم هەموو دەریایە
جەراعەتی  برینی ڕۆحی منە بەفوارە دەڕژێت
توهێندە ساکارانە دان بۆکۆترەکان دەرێژی
زەبوونی ئەوهەموو ئەستیرانە چاو ناکەیت
بەخوێنی  من دەدرەوشێنەوە
بۆ ناپرسی ئەوشاخانەی شانیان لەسەر ڕۆحم دایاوەو
بەناجۆریەکانی  من و تۆ پێدەکەنن
ئەودرەختانەی
عومر عومر
لەسەر ڕۆحی من
زیندەگی  تەعویز دەکەنەوە
بۆناپرسی  عومرم لەچەند
ساڵی  دایە
ئاخر ئەم بێداریانەی  من
مایە پوچییە
گەر تۆ ڕەگەزێکی نەسرەوتی
هوشیاریم  بیت.
مادام لەسەرمە
یاری بەرگەزەکانت کەم
چکارم بە مووعجیزەو
جەلالەتت نیە،
ئەو دەنگانەی  هەندێک جار

تەزویەک لە ڕوحمدا دروست دەکەن
مومکینە ڕۆژێکیان
لەچاوی چۆلەکەیەکدا
هەستی پێبکەین،
سانایيە
لەهەناوی ئاورنگێکدا
نمە بکاتە سەر کوڵمی ساردی
گەڵایەک.
سانایيە
س..ا..ن..ا..ی..ە..

هاوینی
/2001/ڕۆما

بەکەڵکم نایەت
نە عەشق
نە ژیان
نەگریان
کلۆڵم دەکات
ڕاز و پێکەنین و ژاکان
بڕوات بێت ئەی جەلاد
عاشقی ڕوتەڵە ئەی دانا
نیهایەت دەبیتەوە خۆراکی
ئەژدیهاکانی خوا
ئەکری جەنگەکان ببەیتەوەو
جەنگەڵەکان مسۆگەرکەی
ئەکری عەشق ببەیتەوەو
عاشقەکان بەختەوەرکەی
ئەکری ژیان بنوسیتەوەو
جیاوازی پا شەکەوت کەیت
بەڵام ئەی مرۆڤ
ئەی ڕەگەزێک
لە ژەهرو
لەتارمایو
لە تۆفان
بە هەر سنورێکا
بە هەر مەشخەڵێکەوە
بەژێر سێبەری ئەم یەقینانەدا تێپەڕی
چەتە زۆڵەکانی خوا
تارماییە کەسکونەکانی شەیتان بەسەرتەوەن
ئەتبرێننەوە
وەک چۆن ژمارەکان
لە هەناسەیەکدا لەیەک دەردەکەینو

ئەسرپێنەوە
وەک چۆن ئیملای خوار و خێچی منالّیمان
لەسەر تەختەرەشی مەکتەب دەسرپییەوە
ئەتخۆنەوە
وەک قومێک ئاو
وەک پێکێک شەرابو
ئاوی زینان,
بەربادت دەکەن
وەک گولاڵە پەژموردەکانی وەرزی زستان
بەفریات نایەت
خەونی جوان
هاودەمت نابێت رازی پەنهان
نایەتە ژێر باڵت تەنها گولێک
نابێتە هاودەمت تەنها شەوێک
بەلام ئەی مروزَڤ
ئەی درندەترین خوا بە نەعلەتی خۆت
ئەی ناپاک
بەهەر ئاسمانێکدا هەڵبێی وەک تەرزە دەرژێیتەوە کۆشی خۆت
کوان لەکوێن بەهەشتو
جەهەنەم لەکوێیە
وەرزی سۆراغو
رۆژی حەشر و نەشر و شەوی موناجات
کوان لەکوێن
شمشێری تۆڵە
سێدارەی مەرگ
خۆشی وخەرابات
بەشە موڵکی تۆن جەهەندەمی فیراق
کۆستی گران
ئاهوو ناڵەی حەیات
گەنجینەی خۆتە ماڵە بێ داڵدە و وێرانەکانی دڵ
پاشەکەوتی تۆیە
قیامەتی عەشق

ئابڕووبردنی دڵ
داخو کەسەر و هەیاجات
بڕوانن یاران
بڕوانن
لەچ غەزایەکی خۆشداین
غەزای سەربڕینی فرزەندەکانی عەشق
تەماشا چ لەزەتێکی تێدایە
ترۆکردنی باران
ڕووڕەشکر دنی بەفر
تام کردنی خوێنی دڵان,
بڕوانە چ هەوەسێکە
پشکنینی گیرفانەکانی ( با)
پەردەهەڵماڵین لەسەر ڕوخساری ڕاز و گەڵا
تەفروتوناکردنی ڕەونەقی جوانی بەنان
بێ بایەخ کردنی کزەی جەرگو
نوزە نووزی حەنان
تۆئەی ئەوەی بەو بەرزاییەوە
دەستت لەسەر کەشتیی بەختیارییە
تۆئەی ئەوەی وەک دێوانە یەک
لەسۆراغی هەرمێ دایت
ئەی ئەوەی مەراقت دێت بەمەرگی یادگارم
بەڕۆحی بەرباد و سووتانی بەهارم
ڕۆژێک منیش پێکەنینم بە
دارشەق دەهات
هەیکەلی خۆم
لەپارچە تێک شکاوەکانی ئێوەدا بینا کرد
بڕوات بێت
ئەی جەلاد،
عاشقی ڕوتەڵە
ئەی دانا
ڕۆژێک دێت کرێوە ئەت گریتە چوار چێوە
ڕۆژێک دێت وەکومن

دەبیتە یاوەری  دارشەقو( با) ئەت با.......
ئا ا ا ا خر
خواکان لێناگەڕێن
ئەی ئەوەی رەزیل ترین خوای  منی و
ئەی  منێک کە بزێوترین خوای  ئێوەم
واوەیلا بۆخەرابات
ئەی  مرۆڤ
واوەی  لا

2002/12/12
ئەڵمانیا

## بەدیار چاوەڕوانی غەریبەیەکەوە

سبەینی خوا لەدایکدەبێت
بڵێن بەئەستێرە و خۆر و باران
گوڵاو بپرژێنن
سبەی  شەو هەور ژان دەیگری
بڵێن
بە گوڵەکان با خەبەر ببنەوە تاوێک
بۆ باوەشکردنەوە
لەنمەکانی  باران
بە( با) بڵێن
بسرەوی  تاوێک
لە ڕاژەندنی  جەستەی  سنەوبەر
بەباخچە بڵێن
لێگەڕی  تاوی
لەمیوان داری
پە پولەو چۆلەکەو دۆستەکانی  هەرمی
ئەی  بێقەراری من
لە پشت ژاوە ژاوی  چەمەوە
ڕنگەکانت
بۆهێندە نامورادن لەژاکان
ئەی  نیگەرانی  من
لەپشت پەژموردەی  باخەوە
سبەینی مانگ دێتە دنیاوە
بەسە وەرسبون لە کەون
سبەینی
دێوانەکان.. بەعەسا و تەزبیحەوە،
منالان.. بەدەسرازە و زرزرەوە
شێخەکان..بەمشکی و فەقیانەوە،
دەروێشەکان..بەتەپڵ و زەرگەکانەوە
خواکان
بەرەشەباو

شمشێرو

دارستانەوە

هەموان دێن

باخەکان دێن..ڕەزەکان دێن

سبەینی شەڕەکان لێرەوە دێن

ڕەنگە سبەینی مەرگ بمرێت

بێگومانم لەپشکوتانی نازناز

لە ڕورەشبوونی تری

لە هەڵاتنی مانگ

بەدگومانم لەوەی قەبرەکەی ژیانم هەرتەنگو

کوختەکی تەنهایم نوتەکو

باخەکانی عەشقم پەژموردەو

دورگەکانی خەندەم هەر ساختە و بێ هیوا نەبم

ئەی عەشقی من لەپشت عەزابی ڕۆحەوە

سبەینی خوا لەدایک دەبێت

بەڵام من چکارم بە

مانگو

ئەستێرەو

بارانە......,

بێمنەتم لەپوشکوتنی نازناز

لە خەندەکانی گێلاس

لە ڕەونەقی تەڕی هەرمی

بێمنەتم لە با

لە مەکر و نازی گەڵا

لەشنە شنی هەوا

مانگێک دەخوازم لەڕەحمی منەوەبرژێو

بە بارانێک موبتەلام

لەوڵاتی من دابکات

چاوەڕێم چڵە ڕێحانەیەک

لەسەحەرێکی گوڵ فرۆشدا

لە سەرەنوێلکی ڕۆحما بڕوێت

چاوەڕێم سبەینی

ئەو مانگەی  هەموان بەخاووخێزانەوە چاوەڕێین
بە تەنهاو ڕوتوقووت
بە هەمومانا بڵاو بێتەوە
ئیدی  خۆم وهەرچی  خوای  شێعرو
هەرچی  ڕۆحی  گیایە پێکەوە دەڵێین
هەموو عەشقی بەخۆشی

2002/1/1
پاریس

# بە دیار مەرگەوە ماتڵ بووم

وردە وردە خەریکە تێدەگەم
کەزیاتر بەشە موڵکی  مردنم نەک ژیان.
بەخۆڕایی نیە ئەو هەموو لەرزین ووەرینو
نیگا هەڵخستنانەم بۆدوور
بێ هۆ نیە هەندێک جار
هەموتانم تاڕادەی  بێ حەیایی خۆشدەویێت
هەندی جاریش تاڕادەی  بێ حەیایی
بێزتان لێدەکەمەوە
ئەوەی  پێی  وابێت مرۆڤ یەکجار دەمرێو
ئەوەری و بۆنی  لە ژیان دەبڕێت
ئەوانە ئەهلی  بەهەشتن
خێڵی  ئەرێ وەڵان
نامن لەژیاندا زۆر جار مردووم،
مردنی وا مردووم
کە هیچ گۆڕێک دەرگای لێنەکردوومەوە..
وەرینی وا وەریوم
هیچ وەرزێک هیچ بایەک هیچ توخمێک
خۆی نەکردووە بەساحێبم
هەندێک جار بەمەرگم هەوای ژینگەم پیس کردووەو
بەعزی جار پێم وابووە بۆنم لە سەرزەمین بڕاوە
بەڵام مەرگ ماندویەتی یە
ئاااخرعومر لەمردندا ناڕوات
کاتژمێری مەرگ
دەریا دەی سوڕێنێت
من بەدرێژایی ئەوسالاَنەی تیایاندا مردبووم
لەزەتم لە بیرکردنەوە
لە ژیانو
لە تۆو
لە ئەستێرەکان دەبینی
ڕۆژێکیان بەرلەوەی بمرم

عەشقی ژیان دەوریاندام
وردەوردە تێگەیشتم
ئەشی من سامانی ژیانبم نەک مەرگ
بەڵام چ گڵ و ژانێکم ئەمشەویان
دەنگێک لەودیوی پەنجەرەکەمەوە هاواردەکات
خۆت ساغ کەرەوە زووبە دەڕۆم
بە حوزنێکەوە
وەک موسافیرێکی خەستە
ئەڵێم ڕاوەستە لەسەرم واهاتم
چ تۆفانێک لەو دیودەرگاکەمەوە دەلورێنیۆ
بانگم دەکات
ئەگەرنایەیت من دەڕۆم
وەک عاشقێکی شەرمنۆک دەڵێم
هێواش ئەوادێم
شلوقە
جیهانی ڕۆح بی قەراریی
لەوە زیاتردەست خەڕۆبوون
چ ژاوەژاوێکی سەیربوو
ئەوسای بەر لە نەمان
من بەدیار هیچەوە ماڵ بووم
ئاخر بەخۆڕایی هەناسەم دەدایەدەست با
تا ئەو جێگەی بی هیوابوون
و بە بارەشو
لێی دامو
شکامو
ئیدی لەڕوومنایە بمرم
بڕوابکە مردنیش جۆێک لە شەهامەتو
ڕووسوری دەوێت
هەندێک جار هەر بۆ هەوەس دەمردمو
ون دەبووم
بۆئەوەی ژیان بەخۆی ورەنگەکانیەوە
بە دواما بگەڕێت

جاران خۆم لەمەرگ دەدزیەوە
بۆئەوەی هەندێک جاربێ باک نەبێت لە مەرگم
نا.. بم بەخشن
ئیتر نایەمە دەرێ برۆن
لە نێوان مەرگ وژیاندا سوسی  نیە
لەنێو ئەم ژوورە چۆڵەی عومرا
بەدیار هیچەوە ماتڵ بووم
ئیدی  لەڕوم نایەت لەگەڵ ئێوە بێمە دەری
بڕۆن

بەهاری 2001
کارالیس

بۆ سێبەرە دوورەکانی ئەو
بۆکۆڵانە جوانەکانی جەهەنم

شەو وەکو ڕۆژهەڵاتیەک
بە زەمیلەیەک مەراقەوە
ئەڕژێتە کۆڵان وجادەکانی غەریبی
چۆلەکەیەک
بەسەرچڵەپۆپەی درەختێکەوە
وانەکانی سبەینی لەبەردەکات
منالێک
خۆی ئەخزێنێتە ژێر هەنسکی مۆمێکەوە،
ڕوبار
پاکوپیسی لەگەڵ کەنارا دەردەکاتو
شکات لە مێکوتە عەجولەکانی گومان دەکات
باران
بەسەر غەزای نەورەسەکانی ئەمرۆدا دەباریو
شەرگەکان لەگوناه پاک دەکاتەوە
چاوەڕێی دروستکردنی قەومێکی نوی
لەگەڵ فریشتەیەکی کەروڵاڵدا
من ئەوکات بەدیارچاوەڕوانی (ناتاشا)وە
تاڵەمووە سپییەکانی سەروریشم دەژمێرم
(ناتاشا)
لادێییەک نیە
بە زەمیلەیەک قەهرەوە بگاتە شار
چۆلەکەیەک نیە لەوانەکانی سبەینی بخواتەوە
ماڵێک نیە مۆمەکان لە حەسرەتی ئەم شەوگارانە ژێرکاتەوە
ڕوبارێکیش نیە
تیجارەت بەقوڵاییەکانو
وەک بارانیش نابارێتە سەرگوناهی بەرائەتو
خوایەک نیە

هەر بۆ هەوەس وەچەی شەیتان بخاتەوە
منت وەک ئەوەی تەوازنێکی گەورەبم
لەنێوان مرۆڤ وگەردوندا
چەند جارێک شەو بەنهێنی ڕادەکێشمە ژورەوەو
پرسیاری دەربارەی (ناتاشا) لێدەکەم
لەو بارەیەوە توی توێی دەکەمەوە لەتاریکی
لەبارەی (ناتاشا) سوئالی دەربارەی خوا لێدەکەم
هەنگاوێک دەچمەپێشێ و
نەرمەکۆکەیەک دەکەم
دەڵێم ئەم شەو وەرە پێکەوەو
بەجێ پێکانی پەپولەدا
(ناتاشا)
بدۆزینەوە
ئەی شەو
تۆ لە شەوی جاران ناچیت
شەوی جاران
لەگەڵ (ناتاشا)دا کۆی دەکردمەوە
لەگەڵ منالێدا دەمانکردە بەرائەت
شەوی جاران لەگەڵ (ناتاشا)دا
لەگوناە وبەرائەتت دەردەکردین و
عەشقمان دەمایەوە
شەوی جاران لەگەڵ (ناتاشا)دا
لەگەڵ
ژیان و
عەشق و
منالێدا
زەربی دەکردین
دەمانکردە کامەرانی
شەوی جاران لەگەڵ (ناتاشا)دا
بەسەر شیعرو
بەسەر عەشق و
بەسەر بەفرا

دابەشی دەکردین

پێکەوە دەمانکردە حوزن
حوزنێک
دۆزەخەکانی دونیامان لەگەڵدا دابەش دەکات
بڕوانە ئەی شەو
ئەمێستا لە تۆپەڵک دوکەڵی دوور دەچم
لەئەگریجە غەمبارەکانی (ناتاشا)و
لە بۆڵە بۆڵی سەرخۆشەکانی ئێوارە دەچم
تەلەفونەکەم هەڵدەگرم و
قەهرێک دەرژێتە ڕۆحمەوە
دەمەوێت لەفەزادا (ناتاشا) ڕوتکەمەوە
دەمەوێت لەهەوادا
دەربارەی کۆچی لەقلەقەکانی سبەینی شتێک بڵێین
جەرەسێک و دوان
(ناتاشا) لەودیو کامەرانیەوە
تەلەفونەکە دەنێت بەگوێیەوە
_بەڵی نائومێدی لەسەر خەتە
+دەخوازم لەبارەی شمشێرەوە شتێکم پێ بڵێی
_لەبرینەکانم بپرسە
+لەبارەی تەنهاییەوە
_ئەمشەو بەسوتفە ڕێی کەوتە ئێرەو ڕەنگە تا درەنگانێک
لەگەڵ عومردا هاودەم بێت
+ئایا عاشقێکی چەتونت بەرێکەوت
لەسەری کۆلانێکدا بە باوەشێک برینەوە نەبینیوە
_ئەو برینانە عومرێکە دەکولێنەوە
+ دەربارەی بەختیاری ......
_ڕەنگە ڕۆژێک مەرەخەس بێت بەرەو ئێرەش
هێڵی پەیوەندی دەپچڕێ و
بارانێک لەخۆوە دەبارێت
خۆم ناگرم وەک منداڵێک شەو دەهێنمە
گروگاڵ

شەو دەهێنمە پێکەنین و کرِوزانەوە
شەو یادگاری سالّە وشکەکان دەدرکێنێت
پێکەوە وەک دومورید
دەکەوتینە دوای سێبەرە دورەکانی (ناتاشا)و
وەک دومندالی پێپەتیش
وردەگەردەرژاوەکانی کۆچی ئەومان گرد دەکردەوە
بی هودە لەهۆش خۆدەچم .........
وردەتیشکەکانی سبەینی
وەک خێلّی قەرەجان
دەکەون بەسەر ئەو شیعرانەیا
کە بریاربوو بەر لە (ناتاشا) بۆکەسی دیکەی نەخوێنمەوە
تیشکەکان دەکەونە سۆراغی ئەو برینانەی
رەگیان دەچێتەوە سەر مێژووی بەردەکان.
یەک پارچە لە چوارلاوە دەکەونە
پشکنینم
روتم دەکەنەوە لە وێنەقەرسیلی یەکانی
(ناتاشا)
وەک بەرمالّی پیرەژنێکی کۆنە
عاشق
لەیادگارو و خەونە بەرەلاکانم دەتەکێنم
تیشکەکان کەولّم دەکەن
لەسەردلّم وێنەی ئیمپراتۆرێکی فاشیل
هەلّدەکۆلّنو
سەدان وێنەی (ناتاشا)
کە بە دلّۆپەخوێنی ئێوارە تاقانەکەی مولوز نوسراوە
دەکوژێننەوە
بەبەرچاوی فرزەندەکانی عەشقەوە
رۆحم چوارمێخەدەکێشن
لە هەفتەبازارێکی قەرەبالّغدا
لەسەرکوتێک لەگۆشتی عاتیفەم دەنوسن
هەراجمانکرد
هەر لەو بازارەدا

چەندجارێک چاوەکانی (ناتاشا)م
لێدەبێتە تیشکە بەربەریەکان
لەیەک هەناسەدا لەعەبای ژنێکی سک پڕدا
خۆم دەشارمەوەو
(ناتاشا) ووندەبێت
وەک کەروێشکێکی ئاوس
بەئاستەم پێڵوەکانم هەڵدەبڕم
دڵم ختورەیەک دەکاو
گریانێک دەست دەنێتە بینەقاقام
ڕەوە ئاسکێکی شەرمنۆک بەلامدا ڕەتدەبن
دەمەوێت هەمیشە
لەبارەی ئەوەوە پرسیاریان لێبکەم
ئاااای چەندە عاشقم
بەم سۆراغە ئەزەلی‌یەی
لەگەڵ نێچیری ڕاووشکارەکاندا
جووتمدەکاتەوە
وەک چیمەن
بەسەرزەمینی فەریکەخەونەکانمدا
بەشوێن گەردەڕژاوەکانی (ناتاشا) دا
بڵاودەبمەوە
هۆشم دێتەوەبەر و سەیرەکەم
گۆرانیم بیرچووە
دەمەوێت کۆپلەشیعرێکی نالی
بۆئەم غەریبستانەی ڕۆح بڵێم
سەرم گێژدەخواو
بەهێواشی وەک چلەژاڵەیەک
دەچەمێمەوە
بێ ئومێد
سەر دەنێمە سەر یادگارێکی (ناتاشا)و
لێی دەنوم....
(ناتاشا) هەڵدی
(ناتاشا) پێدەکەنی ........

(ناتاشا) نوکتەم بۆدەگێڕێتەوە
وەک منداڵ
وڕک لە دەستەمۆکردنی کۆترەباریکەیەکی گرینۆک دەگرێت
لەتەنهایم ڕادەمێنێو
چرکەیەک مات دەبێت
وەک بێچوە کەرویشکێکی ترسنۆک
شەرمێک دەیگری
ئەیەوێت بڵێ
شتێکت باش
ئەیەوێت بڵێت
ماندوونەبیت
ئەیەوێت بڵێت
بیر لە مولوز مەکەرەوە
بەخەبەردێم
دەڕوانم پۆلێک ڕیشۆڵە ڕژاونەتە خوێنمەوە
وێدەچێت ئەوانیش لەدووی (ناتاشا) بگەڕێن
بە سەربالّی ڕەشو
دەنوکی حەواسیانەوە
لە عاشقە ڕوتەڵەکانی ئەو دەچوو
ووتم ڕیشۆڵەکان......
هێندە نابێت شەو
بەدووی (ناتاشا)دا عەشقی کولاندمەوە
پێیەک بەرلەئێوە
تیشکە بەربەرییەکانیش
عەودالّی ڕەونەقی (ناتاشا) بوون
بۆئەوەی شتێک لەڕۆشنایی ئەو قەرزکەنو
دەستەڵاتی خوایەک ساغکەنەوە
ئەوان ڕوتیانکردمەوەو
لەچوارمێخەیان دام
ئەوشۆ
من پتر لە هەیکەلێکی عاجزو و بێگیان دەکەم
بڕوانن ڕیشۆڵە غەمبارەکان

بڕوانن
عەشق مۆمیای کردم
گرتمیە چوارچێوە
بڕواناکەن وردتر دەگەڕێن
یەک یەک نامەکان دەکەنەوەو
یادگارەکانی سەردەمی خوێن بارین
دەخوێننەوە.
دایکم ڕۆژێکیان
کە لە تەراویح دەگەڕایەوە وتی ....
ڕیشۆڵەکان گوناە بارن
مەهێڵن بەسەرگوی سەوانی ماڵو
بەسەرچڵی درەختەکانەوە بنیشنەوە
چەند بەدفەساڵ و بێفەڕن
چ تیرەیەکی ڕووڕەش و بەدقومن
واااای
نیگەرانمو......
دڵم لەلای تەنها ماچە تاقانەکەی (ناتاشا)یە
بێ قەرارمو.......
سەرم وەک گەردەلوول
گێژ دەخواو
جەستەم لەسەرشەقامەکانی بێدەنگی دەفڕێنیو
وەک منالێک...
ژیان لەتەنها نیگایەکی ڕەنگاوڕەنگدا
کورت دەکەمەوە
بارانێک نەرم نەرم
دەباری ،
شەلاڵ دەبم لەمەراقو
دڵم بە بێسرەوتی هەورەکان دەسوتی
دڵم بۆ ئەو چڵەنێرگزانە تەنگ دەبێت
کە سەرخۆشێک بۆن و بەرامەی وەرزێکیان دەفڕێنیو
پێراناگەن بیگەیەننە دەستی یار،
دڵ تەنگ دەبم

ئەوکاتەی دەمەوێت بڵێم
ئازیزەکەم
مەرگم بەعەشقت لی بکرە
پرمەگریان دەبم ئەوکاتەی (ناتاشا)ش دەڵێ
ئاخر دەترسم
لە سێبەر ئەترسم
لە جێپێکانی دۆست ئەترسم
لە هەناسەی پەنگ خواردووی ژووری میوان
ئەترسم

ئەترسم ........
لەوەی شومەی ئەو بایە ئەترسم
کە هێمنی دەریا ئەشێوێنی..
بڕوانە ئەستێرەکان چەند دوورن
ئاوەکان چەند عاشقانە دەبارێنو
چەند شەروورانە جێمان دێڵن
بزانە ئەو دەنگە دەنگەی لە بولبولەکانەوە دەبیبستین
کورپوزانەوەیە نەک گۆرانی
چۆلەکەکان بەجریوە
کەبۆنی سکاڵای کوژراوێکی لی دێت
گەڵاکان لەبێوەفایی بەهار ژیردەکەنەوە
تەماشاکە،
ئەو هەورانەی لە شەرما دەبنەئاو
چەند تینوی گریانێکن بەدزیەوە
ئێمە پێمان وایە دەبارێن
بەڵام دواین پەنابەرە بەدگومانەکانی خاکن ئەوان
ئاخر (ناتاشا) گرانە گران
ڕاگرتنی ئەم تەوازنە ناجۆرانەی عەشق
بەم دەستە لەرزۆکانەی گومانەوە
گرانە گران،
ڕاست کردنەوەی پێوانەکانی دووری
بەم تەرازووە ناشیانەی خەیاڵ کردن
نیگەرانتم بەدووری نێوانمان

نیگەران
بێقەرارتم ئەی  ئەوشەوە ڕوناکانەی
لەخولیاشما جارێکی  تر
هەرگیز دووبارەنابنەوە.

2002  /8/12
لیۆن

## وتنەکانی بەرد

دەڵێن واقوڕمانی تۆ
لە نێوان
بەردێکی سەرئاوکەوتو
ڕێحانەیەکی سەر ئاوکەوتودا
پەیوەندی بەهەژاری
یۆتاپیاوە هەیە
تۆ کە هەمیشە ئازارێک لەسەرت ڕاناوەستی
نەختێک لەگەڵی بکەویتە مەراقەوە..
پەیوە ندی بە شلوێبونی ڕۆحەوە هەیە
ئەو جار نا جارانەی وەک منداڵێکی لە ڕشەبا ترساو
لە خۆیدا هەڵدەکورمی و پەنەموس دەکات
من هەر وتم قەینا
ئیتر ناخوێنمەوە
بۆ ئەوەی بەهۆی بێ ئۆقرەیی سەرمەوە
ڕۆح نەخەمە مەراقەوە
وتم گرنگ نیە ئیتر نانوسم
بۆ ئەوەی لە وەیشومەکانی لۆژیکدا
شوعور بریندارنەکەم
ئیدی شەوێک ئەوهات شیعر
هەمومانی لە مندا نوسییەوە
منی لە هەمومانا خوێندەوە

* * * * *

دەمەو عەسرێک
ئەوکاتانەی منداڵان موشەموش دەگەڕێنەوە
ماڵێ
سۆنەکان قەراغ تەنهایی دەکەون
چۆلەکەکان لە فرین چۆرە بردەکەن
گەڵاکان لە پاڕانەوە بێزاردەبن
دێنە ژێر باڵم، هەور
هەور کەهەمیشە لە نەنگیم دەگەڕێن
پێیان وایە بەکورێکی ڕوتوقوتی ئەوان دەشێم

ئەرژێنە ڕۆحمەوە گیا
گیای  بێ بار
بێشەرمانە پێیان وایە بە هەتیوێکی
تەرە کەوتووی  ناوئینجانەی  ژوری  نوستنی
ئەمیر دەچم،
ئەوان بەد حاڵی  بون
من لەو ڕێرەوە تاریکو
لەنێو ئەو ئاسمانە بچوکەی
بەماچ کردبومان بەماڵ
هەر لە منداڵی  خوا دەچوم
ئەو کاتەی  ویستی  لەجنسی  پشیلە قورمیشمانکات
بۆ تریقانەوە و هەزەل
بەڵام ئەوان دەڵێن
ئەورۆژەی  وەک و باران تۆمان لەسەر پەژارەی  بەردێک هەڵگرتەوە
بەشتێک دەچویت کە لەشت نەدەچوو
پتر بەلێزمی  بارا نو
هاژە هاژی  چومێکی  سەرەڕۆ دەچویت
تۆلە هیچ نەدەچویت..........هەر هیچ
خولیای  پیغەمبەرێک بویت
کە لە شەرما موعجیزەکانی  تەنها بۆ ئاو
بەیان دەکرد
ئیتر من دڵتەنگی  ئەوانم
کوان لەکوێن
نوتفەکانی  من لەکوێن
کوان لەکوێن
عەبدە بەرەڵاکانی من
کەوتونەتەکوێ تەلیسمی  ئەم ڕۆحەوە
بۆهێندە پرزۆڵ پرزۆڵ
ڕژاونەتە خوێنی  شەوەوە
هەر دەڵێی خواوەندی  تاریکیم
واااااای  مەخلوقاتەکانم چەند ئەفسوناوین
ئەز چ خالقێکی  شەرمندە و ڕەزیلم وا !!!!ی

ئیتر نیوەی  تەمەن تێپەڕی و ئەوان هەر نەگەشتن
ئەوان دوا فرزەندەکانی  سەعادەت
هێندەش نیە هۆزەکانی  فیتنەو
بازرگانەکانی  ڕۆح
لەم هەرێمەدا باریون
ئەو بەیانیە دڵم ترسا
کاتێک سەرگوێسەوان کۆڵان دارەبەرزەکانم بینی
سیواغ درابون بەڕەنگی  تازە باریوی
ئەوان
پەیوەندی  بەماسۆشیەتی  ئاگرەوە هەیە
ئاگر کەهێندە عاشقانە
مەملەکەتەکانی  خۆی  لەخۆیدا ڕوناک دەکاتەوە
چ پەیوەندی  بەتاریکەسەتی  ماڵەکانی  ئێمەوە هەیە
ئەو ماڵانەی  ئۆقیانوسێکن لە شەبەح وتارمایی
ئەڵێن ئەوان
بازرگانی  ڕوناکین
بە مسقاڵ ڕۆح ڕوناکی  لەئەستێرەکان دەکرن
چۆلەکەکان دوودڵ نەبوون
لەگێڕانەوەی  زانیاریەکانی  ئەوان
هەندێک جارکۆترەکان دودڵبوون لەوەی
چۆلەکەکان سەلیقەی  شاهیدی دانیان ببێت
بەڵام بۆنەگەشتن ئەوان
کە هێندەنابێت
لە ڕۆح کێشانی  فرزەندەکانی  ڕوناکی بوونەتەوە..
من وتم
ئەگەر بنوسم جەنگێک لەناوەوەم ڕا  بەرپادەکەم
جەنگێک ڕۆح تێیدا دەدۆڕێت
ئیحساس دەکەوێتە مەراقەوە
ئاخر ڕەگەزەکانی  من هێندە ناجۆرن
بەخوێنی  سەری  یەکترتینوون
دەڵێن
ناجۆریەکانی تۆ

پەیوەندی  بە فەنابوونی  خواوە هەیە
خوایەک کە لە شەوە تاریکەکاندا بەژێر لێزمەی بارنو
ڕێژنەی  غەریزەدا
بەخۆی و مانتۆیەکی  درێژەوە
لەدووی  کەرتەناسازەکانی  خۆی دەگەڕا
عەودالّی  ئەوگەردانە بوو
کە هەرگیز لەگەڵی  گردنەبووینەوە
نا هەرگیز
هەرگیز .

زستانی/ 2000
پاریس

# ترێ ڕەشتاڵەیەکی پیر

بڕیارم داوە...
لەگەڵ ڕۆحی  ئەم ترێ چاوڕەشە جەهەنەمییەدا ببمە دۆست
بڕیارە، تادرەنگانێک
تائەوکاتەی  بەهاریش حاشامان لێدەکات
پێکەوەببینە
خوایەکی  مەست
خۆمان ئەمانزانی ...
گەر ڕۆژەکان نەگەنە دواپلەکانی  بێحورمەتی
قیمەتی  من و ئەو،
لەو پیاڵە ڕوخۆشە کریستاڵیەدا
ئاشکرانەدەبوو.
بیرمە بەرە بەیانێکی  تووش
سڵاوم لە بەرسیلەیەکی  کاڵ کرد
بەفیزێکەوە ڕوی خۆی  لێوەرگێڕام
خۆمان دەمانزانی .......
ماویەتی  نرخی  من و ئەو
بەم باخەوانە دڵ ساردە مەزەندە نەکرێت
ئێستە کە هاوڕێیەکی  دڵگەرمی
ئەم ترێ  ڕەشتاڵە جەهەندمییەم
ئەزانم هاوڕێیەتیم لەگەڵ ژیاندا
بە کچێکی سەرەڕۆی  ژیاندۆست دۆڕاند
تۆ پێت سەیر نەبێت
ئەم ڕۆژانە...ڕۆژی لێکترازانی  منە لە
موعجیزەکان
ڕۆژی  دەست بەرداربوونی
منە لە من
منێک هەنگاوەکانم دەزانن
تاریکایی ژیان...چەند لە قیمەتی ئەم نیگاسەرشێتانەمی
کەمکردۆتەوە،

ئەی تۆ...
ئەی تۆپەڵێک لەدووکەڵ و لە گومان
پێموایە
ترازان ئەوکاتە دەست پییدەکا
هەست دەکەیت بەیانیەک
چۆلەکەکان ناجریوێنن
پشیلەکان نامیاوێنن
هەر لە خۆوە
سەگەکان ناحەپێنن
هەست دەکەی  باخەکان پەژموودەو
کوچەکان خاڵین لە سێبەری من و تۆ
لە فەجرێکدا بەرووتی
هەست دەکەیت هەنگاوەکانت بەرەو جێگایەک کێشت دەکەن
پرە لە کەلەسەری  ژن وپیاوی لێکترازاو
پرە لە کۆتری  بێ باڵ
پرە لە پەپولەی  عاجز
پرە لە عاشقی  سوتاو
پرە لە ئەستێرەی  کوژراو
پرە لە منالی شەرمن
هەست دەکەی ئەم هەرێمە پرە لە من
منێکی
زۆۆۆۆرررررر.....،
بەهێمنی  وەک کێشانی  جگەرەیەک
لەبەر پەنجەرەیەکی  یەئسدا.
بەهێمنی وەک دالغەی  هەمەجێیانەی  منداڵێک بەرەو مزگەوت
بەهێمنی  وەک ئەوکاتەی عاشقێک نامەی کۆتایی
بۆ عەشیقەکەی  دەنوسێت
بەرەبەیانێکی  تووش
هەست دەکەی
شتەکان ناتناسنەوە
عەینەکەکەت نادۆزیتەوە
پێڵاوەکانت

پاڵتۆکەت
کتێبەکان
شیعرەکانت
گۆچانەکەت
بووکە شوشەکان......
هەست دەکەیت یادەوەریت
کاڵ بووەتەوە
بەهێمنی وەک ئەوکاتەی
لە خۆت دەترازێیت
هەست دەکەیت دووباڵت لێرواوە
بی حەزی خۆت
کێشت دەکەنە جێژوانگەی
ترێ ڕەشتاڵە یەکی پیر

*　　*　　*　　*

ئەوەی دۆستی ژیان بێت
دۆستی لێکترازانی منە لە تۆ
دۆستی دەست بەرداربوونی منە لە بەهار
ئەوەی دۆستی ژیان بێت
دۆستی دەرکردنی منە
لەسەر ئەم سفرەیەی عەشق
دۆستی ترۆکردنی منە
لەم بازاڕی گومانەدا

*　　*　　*　　*

ئەوەی دۆستی ژیان نەبێت
دۆستی دەست بەرداربوونی ئەوە لە من
مەستی خۆ تەکاندنی ئەوە لە تۆ
ئەوەی دۆستی ژیان نیە
دەستی لەخوێنی ئەم نێچیرە شەرمنانەی
گوماندا نیە
بێبەریە

لە ڕەشەکوژی خەونە جوانەکانی گوڵەباخ
دەستی لەسەر کێلونەکانی غەریزە
ترازاوە
ئاااخ لەمن ئاااخ
وااای لە تۆ وااای
ئەمزانی بەکەڵکی ئەم ئاشتی یە نایەم
لەگەڵ عەشقا،
ئەمزانی بەرگەی ماچ و مۆچەکانی تەبایی ناگرم
لێم گەڕی..
وەکو شەو ڕەش بچمەوە
بۆ وەی شتێک لەبارەی منەوە
نەتخاتەوە سەرکەڵکەڵەی عەشق
هەلهەلەی ژیان ،
لێم گەڕی ...
تەنهایم ئاسەواریک
لەسەر لێوی ئەم تری ڕەشتاڵە پیرەڵە
جەهەندمی یەجێهێلێت ،

* * * *

بەمن چی دەستە ساردووسرەکانی تۆ
لەنێو باخچەی ئەم ئەوینە تالانە یا گوڵ بگرێت
بەمن چی ماچەکانی تۆ
گەر هەنگوینی نێو ئەم شانانەی گومان بیت
بەمن چی بەهەشتی چاوەکانی تۆ
گەرگۆڕستانێک بن
بۆکفن کردنی هەزاران دڵی منی وەک من
لێم گەڕی ....
بە خوێنم ڕەسمی ئێوەرەیەک بکێشم
کە لێرە نیت
باسەرم بدەمە دەست
سەربوردەی شەوێکی تار

بارۆحم ببێتەرێبەری  ترێیەکی چاورەشو
بە بێوەی بیهێنێتەوە مال،
لێت ناشارمەوە ئەی شار

من بەتەنها عاشق نەبووم............سەگیش بووم

بەتەنها  ئینسان نەبووم............شەیتانیش بووم

بەتەنها  شاعیر نەبووم................حەقیریش بووم
ئەگەر رۆژێک
شەماڵێکم بەم کوچەدا تێپەرییێت
گەردەلولێکم لەم شارەدا چەتەبووە
ئەگەر شەرمنانە دەستم بۆ لیمۆیەکی  سەرسینگت درێژ کردبێت
شەرورانە باخچەیەکتم قەتلۆعام کردووە
ئاااخ  لێم گەری،
هەناسەی  کوژراوێک بم نەگەمە سەرمەیلی
وتنێک وبمرم

لێم گەری .......
شێتانە سەرم بەم مەنجەنیقانەی
تەنهایی  خۆمدابکێشم

لیم گەری .......
من دەزانم ترازان ئەوکاتەدەست پێدەکات
کەلەچاوی  چۆلەکەیەکدا ناجۆریەکانی  من و تەباییەکانی تۆ لەیەک دەچن ،

## سەر بووردەی شەوێکی تار

شەودادی و دەمەوێت بنوسم
دەمەوێت وەک باریکەیەکی دڵشکاو
دوور دوور بفڕم
وەک تۆفان شڕوشیتاڵی ئەم ئەندێشە ناسازانە
لەگەڵ خۆم لول کەم‌و
ئیدی بڕۆم
ئەمەوێت بنوسم‌و
شەو دادێت و شوشەی خەیاڵم
وەک ئەوەی زیل زالێک
لە ماڵەکەی تۆوە بیهەژێنی
کتوپڕ هاڕەدەکات
وەک ئەوەی بایەک لەماڵەکەی تۆوە بێت
دڵم باتە بەر نەشتەری گومان‌و
تەنهایم لێهارکات
خوێنی ئەوینم لا تاڵدەکات
خوایە بۆمن تەنهام؟
خوایە بۆ تۆ تەنهایت؟
خوایە بەفر بۆ تەنهایە؟
خوایە بۆ شمشێر تەنهایە؟
دەبێت تەنهایی نەعلەت بێت یان حیکمەت خودایە
ئەگەر تەنهایی میحنەت بێت
ئاو هێندە لە تەنهایی خۆی هەڵنەدەهات
تۆ هێندە لە تەنهایدا پەنات بۆ من نەدەهێنا
منیش ئەوەندە ئاشقی شیعر نەدەبوم
کۆترێک دەپرسێت
ژاوەژاوی ئەم چەمانە
خوێنی بەهارم لا تاڵ دەکەن
وەک ئەوەی ئاگرێک لەماڵەکەی تۆوە دزەبکاتە ئەوینم‌و
کوتوپڕ بەربێتە ڕۆحم
گران دەستم بەر سۆرەغی ئەو بوراقانەی سەر سنگت دەکەوێت

تابوتێک والەسەر شانی  خەیاڵ موو
تەرمێک لەتەرمی  ئەو ئەوینە دەچێت
ڕۆژگارێک لەماڵەکەی  تۆوە
دەرژایە سینەی  باخم
خوێنێک لەچاوەکانم دایە
لەوخوێنە سورە دەچێت
شەوێکیان لەنیوان ماندا بە ئاشتی  ڕژا
سەفەرێک داڵدەی  داوم
لەو سەفەرە دەچێت
جارێکیان لەگەڵ گەڵا تۆی  هەڵگرتوو
هەموو
گوڵەکانی  دونیای  لێ تۆراندم
لەو هەموو غەزا بەربڵاوانەی  عەشق دا
دەستکەوتی من غەنیمەتی  تەنهایی بوو
ئیتر هەر تەنها دەبم
ڕۆحم بەتەنافی  نامورادیەوە هەڵدەخەمو
گرەی  پایزانێک لەماڵەکەی  تۆوە
بڵاو دەبێتەوەو
تەروبڕی  خونچە بەهاریەکانی  عەشقموشک دەکەنەوە
لەدەستم دان
خۆرەتاوە هەرزەکارەکانو
گڤەگڤی ئەوشەماڵەی جوان جوان
دەیان کردین بەماڵی  بەهاردا
ئیتر هەر بە تەنها دەبم
بە تەنها
وەک دێوانەیەک چاو دەبڕمە تەنهاترین ڕێگا
بۆگەشتن بەموراد
ڕەنگە گەشتنە موراد
دڵدانەوەی  نامورادی  بێت
پێدەچێت نامورادی  هەوەسێکی  تاڵ بێت
چ لێقەومانێکە سەعادەت بە ڕێبواری
چ لێقەومانێکە زیندەگی  بەبێ تۆ

## ڕێحانەیەک غەدر لە گەنجێتیم دەکات

سەرخۆشم بەبۆن و بەرامەی شەوێکت
بەهەشتم بیردەخاتەوە
بۆن دێت
بۆنی شەمامەی خاڵ خاڵ
بۆنی نێرگز و ڕێحانەڕەشە و کزەکزی شەماڵ
بۆن دێت
بۆنی دڵەکوتەو
خەونی ئاڵوواڵای ژیان
بۆنی ئەو ڕۆژگارە پەمەییانە دێت
کە پێکەوە
لەگەڵ (ناتاشا) دەبینەوە میوانی ژیان
(ناتاشا) بەو خەندە عەجولانەی سەرلێویەوە
تکاکارە بەر لە من چرای ماڵە تەنهاکەمان داگیرسێنی
تکاکارە زووتر لە من گوڵە نازنازەکانی عەشق ئاوبات
منالآنە لە بۆنی ئەو ڕۆژگارە ئالآنەدا
بەنێو چیمەنەکانی یادگاردا ڕادەکاو
لە دورەوە دەڵێت هەڵی بێنە بەچاوماندا
هەلی بێنە بەدلّماندا
هەڵی بێنە بەرۆح ماندا
کامان عاشقترین مانین
بەناوی حۆرییەکی پاکیزەوە دەڵێت
هەڵی بێنە کامان ڕوسورترین مانین
ئەی یار
من دەڵێم بەو هەمو خەونە یاخیانەی
سەرمانەوە
کامان فیدایی ترین مانین
ئەی یار
هەڵی بێنە بە چرۆیەکی ڕۆژهەلآتیدا هەڵی بێنە
بەهەشتی ترین کامانین
کامان دێوانەترین مانین

کامان

کامانین

کامان

بۆندێت بۆنی تەپەتەپی دڵی یار
بۆنی ڕاز و خۆزگە و ئەوین و عەشقی یار
بۆندێت بۆنی شەمامە
بۆنی شەو
بۆنی عەشق و غوبار
بۆنی کۆڵانە بێڕەحمەکانی کیل
ئەوەتەی هەم هێندەی ئەمشەو
با دۆستی حەزەئارەزوی عەشق نییە
بەڵام ئەمشەویان بڕوانن
چ دەلالێکی جادوبازە (با)
بۆنی ئەگریجەی بێنازی یار ئەیا بە پەنجەرەکەما
بەشەپۆل یادگار و جًێ پێ کانی (ناتاشا)
دەکات بە ژوری عەشقما
بە هۆقە خەندەی ئاڵ لەسەر لێوی (ناتاشا)
دەفرێنی
باوەش باوەش بۆنی سەر سنگو
هەناسەی بەجێماوی ناو ڕاڕەو و نێوکۆلانو
باڵکۆنەکانی ئەوم تێدەگرێت
وای لەچ شەوێک دایە عەشق
لەچ جەنگێک دایە ژیان
تێناگەم
بەچ دەنگێک دەمهێنیتە زمان
چ هەوەسێک دەمخاتە سەرشەپۆلی ژان
بۆندێت
بۆنی بەیان یانێک (ناتاشا)ی تێدا ماچ دەکەم
بۆنی ماڵێکی بچکۆلە دێت
کە پڕپڕە لە هەردوکمان
بۆنی ئاوێنەکەمان دێت
کە پڕپڕە لەوێنەی جوانی هەردوکمان

بۆن دێت

بۆنی  شەقام

بۆنی  عەشقو

بۆنی  بۆ هەتا هەتایە ژیان,

سبەینی ڕۆژ هەڵدێت
من بەجانتایەک عەشقەوە
چاوەڕوانی  (ناتاشا)م
بەزەمبیلەیەک ژیانەوە
بەدوای  سێبەری  ئەو دەریاگەورەدا دەگەڕێم
بڕوانە گوڵەباخ گیان
چ ئاوازێک دەمخاتە سەر هەل هەلەی  ژیان
بڕوانە چ عەشقێک دەمهێنێتە سەرکەڵکەڵەی  گریان
بۆندێت
بۆنی  ئەرۆژگارە پەمەییانەی
کەدەڵێم
ئەی گوڵم هەناسەی سوتاوم دەگاتەماڵەکەت
وادەبم بەپەیکەر بۆ جوانی شارەکەت
پەیکەری شاعیرێک کە پیربوو لەڕێتا
لێگەڕی ببێتە مەعبەدی  خاکەکەت
دە توخوا لێگەڕی بابم بە بەفر
گشت شەوێک داکەمە سەربانی  ماڵەکەت

بەهاری /2003
پاریس

## باخە دوورەدەستەکانی یار

چرایەک لەتەنهایدا عەشقێکی خۆی دەسوتێنی
هەورێک لەغوروردا دەگری.
دەستم لەژێر درەختەکانی گوماندا
نەرم نەرم ئەویش دەگری
تەرزەیەکی سەرەرۆ
پەنجەرەیەکی یادگارم دەرۆشێنی
بارانێکی لەخۆبایی
دەست دەنێتە بینەقاقای ئەوینێکم
هەروەکو با بە هورووژم
خۆم دەکێشم بە مەوجەکانی دەریادا
وەکو ئاگر هەرچی گژوگیای مردووە
لەم رۆحەدا دەسوتێنم
چرۆیەک دێت دەستم دەگرێت
ماڵ بە ماڵی ئەم بەهارە بە دوای
گوڵە دالیایەکی عەشقی تۆدا رۆح دەگێری
وەرزێک
دادێت کەس نایبینێت
ساڵێک دێتە ژیانەوە کەس نایناسێت
مانگێک هەفتەیەک رۆژێک
دەبنە برواری عەشقو
لەورۆژەدا کەس ناتوانێت عاشق نەبێت
وەرزو ساڵ و مانگ و هەفتە و رۆژ هەر منم
هەمو چرکە کەسکونەکان لەو رۆژەدا دەبنە لازۆ
چرا ودەست و تەرزە و ئاگر و باران و ئەوتۆفانە سەرشێتانەش دەبنە (لازۆ)
شەو لە قوڵپی گریاناوی شیعرەکانم بەخەبەردێم
لە ژانەسەری مەلۆتکەی
نێو جۆلانەی ئەوینێکما
رادەچڵەکێم
لەبەر دەرگای ماڵی عەشقا
بە باوەشێک برینەوە

که هی خۆم نین موڵکی  شیعرن
به ئەسپایی سێبەرێک دێت
له سێبەری  ئەگریجەکانی  یار دەچێت
هێدی  هێدی ......
له هەناویا دەمخەوێنی،
(خواخان)
پێ به پێی بارانو
شان بەشانی  ڕێحانەیەکی  چاوڕەشی  ڕۆژهەڵاتدا دەگاته لام
بەوسیحره ئەفسوناوییەی  نیگاکانیا
دەبێته کابانی  ماڵمو
حوزنێک که له گەروویدایه
بێبەریم دەکات لەخۆمو
کۆتره شینکەی  بەرپەنجەره چاوەڕوانیم
دەتۆرێنێت،
(خواخان)ئەڵێ:
چیت لێم دەوێت
که دەزانی  مردن بووه بەئاوێنه و چراخانو
تابلۆکانی  جیهانی  من
چیت لێم دەوێت
که دەزانی  لەوەتەی  هەم
ئەڵقەی  مردن کراوەته پەنجەکانم
لەوەتەی  هەم
هەموو شەوێک مردن وەکو
ئەژدیهایەک غافڵ نابێت له تەنهایم
سرووەیەک له دوورەوه ڕا هەڵدەکا
خۆی  دەخزێنێته ژێر هەنسکی  حوزنێکمەوه
بەو باوەشه برینەوه
بەردێک دەهێنمەگریان
سەربەرز دەکەمەوه چاوەکانم
هەڵدەیەم بۆدوور
کەشتیەک بەلامدا ڕەت دەبێت
پڕپڕه له (لازۆ)

کەشتیەک هەڵمدەگرێت
پڕپڕە لە زۆڵە شیعرو زۆڵە عاشق
هاوار دەکەم
تکایە ئەی کەشتیەوان
ئاڕاستەی ئەم دەریا بێبارانەی
کامەرانی بۆکوێم دەبات
تکایە وردە ماسی ئەم ئەحلامە جوانانەی عیشق
مەترسێنن
تکایە ئەی کەشتیەوان
ئەوشەپۆلە خەم ساردانە
بەرەو کام کەناری بێ (لازۆ)یی کێشم دەکەن
کەشتیەوان
ئەمەوێت بەر لەوەی سەوڵەکانی ئاشت بونەوە
لەگەڵ ئاودا بناسمەوە
با دڵم بەو هەموو عەشقەوە
بۆ ماسیەبرسیەکانی دەریاکانی حوزنی (لازۆ)
بەربەمەوە
تکایە....تکایە
تکایە ئەی میتەرەوان
من ماتی ئەوانم کوان لەکوێن
ئەی مەیتەروان
کوان فەرزەندەکانی عاتیفەم
کەوتونەتەکوێی تەلیسمی ئەم ڕۆحەوە
بۆهێندە پرزۆڵ پرزۆڵ
ڕژاونەتە خوێنی شەوەوە
هەر دەڵێی خواوەندی تاری کیم
مەیتەرەوان
کوان ئەسپ سوارەکانی عەشقی من
رەشوی ماینە یال َزەردەکانی تەنهایم
وا بە دەستی کام ڕەشەبای مەینەتەوە
بلێی ڕۆژێک پێ ڕانەگەم
وەک عاشقترین مەیتەرەوان

تینوترین ئەسپی خۆزگەم
لەسەر تەڕترین کانیلەی
عەشقی خواخانەکەم ئاو یەم
شایەت ڕۆژێک پێ ڕانەگەم
وردە بەرسیلەی وەریوی دڵی (لازۆ)تێر تام نەکەم
بڵێی ڕوژێک
بە کامی دڵ تێر بۆن نەکەم
ئاخر ناشێ هەر نەتوانم بەر لە مردن
تەنهاماچێک لەسەر لێوی خواخانەکەم
جێنەهێڵم....
بڵێی توخوا ڕۆژێک نەیەت
لەسەرەڕێی مزگەوتێکا لەبەر دەرگای مەکتەبێک دا
لەسەر سیلەی کۆڵانێکی زستانەدا
بەسەر چڵی درەختێکی غوربەتەوە
بەئاوازی شیعر و ماچێکی بەهاری
خواخانەکەم تەڕم نەکات
بڵێی شەوێک
بە بەرامەی لیمۆکانی مەستم نەکات؟
ئەشێ وەرزێک بەدوای گوڵەنازنازێکی مەرگی خۆیدا
وێڵم نەکات

پایزی /2003
فرنسا_لیۆن

## ئەو شمشێرانەی ئاوس بوون بەگوناە

ئەوان درەنگتر
لەگرِوگاڵە وەنەوشەییەکانی ئێمەو
نزیکتر
لەخوێنی مەیوی نوکی رمەکانی خۆیان
کۆلانە تاریکەکانی چاخە تاریکەکانیان دەپشکنی
ئەوانە
نە بە سێبەری نێرگز و نازنازەکانی
سەر پاساری عەشقەکاندا رادەبورین
نەتروسکایی مۆمێکیان لەو دەیجورەدا بۆپێدەبیَو
نە دەیانپەرژایە سەر ئاودانی باخچە تەرِتەرِەکانی موحیبەت
درەنگتر باران
بەقەتڵوعامی گوڵەکان راگەشتو
زوتر وشە هەڵواسراوەکانی گەرومان
بەزمانمانەوە بۆ بەربانگ قوتدایەوە
ئەمێستاش
بە باوەشێک مێژووی دۆرانەوە
سەری کاسما ن بۆ ژێر دەواری کام حەکیم بەرین
بەم جەستە یاخی و خوێناوییەوە
چۆن دەتوانین شوێن باڵی فریشتە یەک هەڵگرینو
بگەینەوە سەر لەپی دەستی
عاشقترین خوا
بەم دەست و پەنجە تەزیوانەوە
چۆن دەتوانم لەسەر نوسینەوەی درێژەی چیرۆکی
عاشقە بەربادەکان
بەردەوام بمو
شەوێک لەشەوانی بەرات
بەزوڵەیخای میسر بڵێم
من دەتوانم نۆبەرەی کامەکانی
جەستەی یوسفت بەدیاری بۆبهێنم
شتێکتان پێدەڵێم هەندێگ جار لەحەقیقەت بچێت

بەڵام بەگومانم لەوەی  ئەی  گەلا هەڵوەریوەکانی
حەقیقەتو
ئەی خەنجەری  هەڵکێشراوی  یەقینو
ئەی مەستترین خوا بەخەڵوەتگا نوتەکەکانی  ئێمە
من بەگومانم لەوەی  پارچە بەجێماوەکانی  گومانو
تەمەڕودمان لەنەزاهەتی  یەقین
لەجەستەی  خواوەندا ئاشکراتر نەبێت
بەڵام ئەوان
کەونێکیان لە دەیناسوری  ئیلاە.....
بەرداوەتە جەستەی  بەرائەتمان
ئەفسوس ئەوان لەفەشەلەکانی  مەعریفەوە
خوایان وەک جەنگاوەرێکی  جەربەزە پێناساندین
شەو لەژێر ڕەهێڵەی  گومتندا دەینالآند
وەک عارەفەیەکی پیر هاتنو
بەئاوێنە شپرزەکانی  ئەفسانە تەڵخەکانەوە
تیشکە جێماوەکانی  یەقینیان
دەگرتە کولانەی  ئەو کۆترە عەجولانەی
کەبەر لە شەوارەی  حەقیقەت
پەروباڵی  فرینەکانیان کۆکردبووەوەو
هیجرەتیا تیاکردبوو
هیجرەت بۆسەر ئەودرەختە دوورانەی
کە دەکرا عەرشێکیان هەبێت
بۆ ڕاڤەکردنی  ئەو جریوانەی
بە تاڵەموی  ڕیشی  سوڵتان
کۆت کرابون
مخابن ئەوان
لەسوبحێکدا بە بەرگی  خوێناوییەوە
خۆیان دەکردەوە بەژوردا
کە منداڵی  ئولفەتی  بە سلاَوی  نازنازەکانەوە گرتبوو
ئەوان کە هاتن
شمشێرەکانیان کردە رەورەوەو
دارە دارەیان بەعەشقی  خوێنەوە ئەزبەرکردین

فەرمویان
بۆئەوەی  گۆڕی موبارەکی  باوکەکان ئاوەدان بێت
واجبە گڕوگاڵەکانتان
لە تەوێڵی  شیرەکانەوە گریدەن
هەر ئەوان بوون فەرمویان
جەنگی  ئێوە لەگەڵ ڕۆشنایی سپیدەیەکدا
دەست پێدەکات
کە دەیەوێت ئیشراقاتی  عەقیدەتان
خامۆشکات
گوێمان لەسەلای  ئەو بولبولە
مەحبوبانە ڕانەگرت
کە بانگیان دەکردین بۆنوێژی  موحیبەت
لە میحرابە کریستاڵیەکانی  عەشق دا
دەبوو تەرمی ئەو هەمووکافرە
بە شانە کوتراوەکانی  ئێمە نەگوێزایەوە
دەبوو هێندە ئالودەی  زمانی  ئەو قامچیانە نەبین
کەجەستەی  سنەو بەرەکانیان
مارەمارە دەکردو
وەک چۆن نەدەبوو
هێندە بەزمانی  ئاگر بدوێین
کە زمانی بارانمان لێ حەرامکات
دەبووچیتر تەنهاییەکان ناوبنێین
ئەزەلی خەلیقەت
ئەوتەنهاییانەی لەماڵی کردنی شمشێرەئاوسەکان بەخوێن
دەگەڕانەوە سەر شوهرەتی خواوەند
دەبوو چیتر باوەش بۆبایەک بگرینەوە
کە لە تەقسیماتی ژیاندا
مەئوایەکی بەنسیب نەبوو
نەدەبوو هێندەش بەحەزەرەوە
بەرچینەکانی گومان پڕکەین لە سێبەر
کە هەتاو بۆڕاوکردنی ژوانی قومرییەکان
لە بۆسەدا بوو

*　　　　*　　　　*

(2)

ئێمە ئەوكات لەنێو فارگۆنەتاریکەکانی شوناسدا
دوابەیتی قەسیدەیەکمان دەنوسیەوە
بە ناوی تەنهایی
ئەوتەنهاییە ژەم بووردانەی
دەیبردینەوە سەر نهێنیە تەلآییەکانی خواوەند
ئەوی ڕۆژی .....
هەر شەوەی لەژێر باڵی گوناهێکی ئەسمەردا
نەدەگەڕاینەوە ماڵی
وەکو زریان ڕەوتی دەریاکانی بەختیاریمان
پێچەوانەی ئاراستەی ژیان نەگۆڕیبوو
وەرزێک نەبووین
وەنەوشەکان ڕاوبکەینو
بەغیرەوە لەتازێی شاپۆراغە مەئویسەکاندا دانیشینو
جۆگەکانی یەقینمان ڕانەکێشایە ناو حەوزەبەرینەکانی گومانەوە
کە ئاوها....
بە نەفرەتی خێڵێکەوە بووین
نزاسوتاوەکانی گوی نەکردین
ئاااخ ئێمە بە نەفرەتی خۆمانەوە بووین
کەجوانترین گوناهی پێڕەوانەبینین
واااى هەمیشەش
قامکی دەستێکی لەرزۆکو
سەری بەژن وبالآیەکی کۆتەرە بووین
گوناهی ئێمە
چەپڵەکوتان بوو بۆ ژیان بەڕووتی
خیانەتی ئێمە هەر ئەوە بوو
جارێک لەباوەشی گوماندا گیراین بەڕووتی
هەموو زوڵمەکەمان هەر ئەوە بوو
بانگەشەمان بۆ ئەیمەنیەتی گوناه
لەڕۆژێکی گوناهباردا ڕاگەیاند
ئیدی ناچاربووین

مالێکمان لەتەنیشت شەیتاندا هەبێت
تادەستی بەزەبری شمشێری نەگاتی
ناچاربووین جۆلانەیەک لە دۆزەخدا هەڵخەین
تا ئامێزی سرِی قەنارەو
کەڵبەی بێ ئابرِوی
کەلەپچەی نەگاتی
هەردەبوو خوابێتە ژوورەوە...؟
****** ****** *****

(3)

ئەکات تولەرِێیەکی پیر
هاتە ژێر باڵی ئەوگوناهە رِوسپی یانەی
کە وەکو مانگ
تریفەی را راییان
دەگرتە هێلانەی
ئەو شەهێنە ئەبلەقانەی
تەفسیری تۆفانە سیلاوییەکانیان
بۆرا راییەکانی یەزدان دەگێرِایەوە
من چیتر دڵنیابووم لەوەی
ئەگریجەی فریشتەیەک
نامانباتەووە سەرحەزە پەنهانەکانی
شەوەزەنگ
هەڵهاتین...هەڵهاتین
بەنێو زۆزانە شەرمنەکانی قەداسەت دا
بەپەنای ئۆقیانوسەمەنەکانی
حەقیقەتدا
هەڵهاتین..
لەوێوە تائێرە هەرقەیرەچناری شەریعەتبوو
رِەدومان دەکەوتو
وتافی شەرمەزاری بەشوێنماندا دەکێشا
لەوێوە تا ئێرە
هەرشاخ وکانیلە و رِەزە مەحرومەکان بوو لەعەشق
سەرەرِێیان لێدەگرتینو

باسی حەلاڵی مەرگ وحەرامی سەرکێشیان بۆدەکردین
گوێم لێبوو مناڵێک
لەڕاوی تانجییەپێغەرینەکان دەگەڕایەوە
ووتی ......
هێی ژیان کاتیەتی
دڵی شتە حەرامکراوەکانمان
بۆئاشت کەرەوە
هەناسەیەک لەولای ئێوارەیەکی خۆرنشینەوە
گوێم هەڵخست
پیرەژنێکی یاخی
بەعەسایەکی جادووبازەوە
بە بەردەم ئاوێنەیەکی بریندارردا
غەزەلی بۆغەریزەکانی شەیتان دەوت
ئەو دەیگووت
کەمێک لە پروشکی ئەو ئاگرە سەرەڕۆیانەی سەرسینگتم پێببەخشە
ئەی ژیان
تا گەنجیەتی لەئاگردا سەوز بێتەوە
بەلام لەوێوە تا ئێرە
هەرجۆگەلەی خوێنی جەستەی چیابوو
بێشەرمانە دەهاتنە ڕێگەمانو
باجی لەش پیسی قەڵەمو
ئەتک کردنی شیعرو
ماڵیکردنی حەرفە سرکەکانیان لێدەسەندین
زۆر لە تەقەلای بیستنی
دەنگێکی خرۆشاودابووین
کە لە نزیک سنورەکانی ئاوابوندا دەهاتنەگوی
زۆر کۆشاین
بەزمانی سەفەرحاڵی بین
موسیڕ بوین لەسەرئەوەی
بچینە دەرەوەی زەمەن
پەردەکانی تاریکی دادەینەوەو
سنورەکان لەچاوماندا کۆکەینەوەو

دەرگا لەسەر هەناسەو
ڕۆشنایی لەسەربوونو
گوتن لەسەر زمانو
ئاوەزمان بەسەر ژیاندا
کلۆم دەین
بۆئەوەی شتێک لەودەنگەی
هەموکەونی دەلەرزاندو
ئێمە حاڵی نەدەبووین
ببیستین
سەلایەک وێدەچوو
لەخوایەکی بریندارياخی بێ
لەساتەکانی بەد مەستیا
بەلام ئێمە هیچمان نەبیست
شتێک نەبێت دەیبردینەوە سەر
سکالاکانی گەلایەک
لەساتی وەریندا و
هەندێک جاریش
بەشمشالێکی دوور حاڵی دەبوین
بەلێوی پێغەمبەرێکی جادووگەرەوە
*******
*********                    **********
(4)
من لێرەم
ئەی یاسەمینەکانی لێواری تەنهایی و
ئەی شەرارە ئارامەکانی خەون بەڕووتی
بە قوفلی ئەم میحرابی غوربەتەوە
بە جوبرەئیلێکی تاوانبار دەکەم بەشەرم
بە ترووپکی کامەکانی غەریزەوە
بە شەیتانێکی موئمین دەچم بەنیفاق
لەبەردەمی ئەم شمشێرە ڕوخۆشەدا
بەعەشقی قوربانی
من لێرەم

به تەونی  جالْجالۆکەکانی یەئسەوە
ڕەدووی  ئاوێک دەکەوم
مەرجە ڕۆژێک ڕێی  کەوێتە باخەکانی  گوناهەوە
چ دووره لەوێ
گوناه وبەرائەت تائەو پەڕی  ڕوتبوونەوە
یەک هەڵمژن
چ دوره لەوێ  بە زمزمێک ئاشنابین
لەسدق بەڕووتی
تا خوێنەمەیوەکانی  جەستەی نەفرەتیمان
داشۆرین
چ دوره لەوێ َ
بەشوهرەتێک ئاوقەبین
کەنارەکان کەمێک پۆشتەیی  لە ئاو قەرزکەن
تا عەورەت وجێگازی لەقلەقەکانی  پێداپۆشن
لە ئاست ئەو هەموو جادووەی
تا ئەبەد
دەرژێنە سەر ڕۆحمان
هەردەبێت خوا بێتەژوورەوە بەڕوتی
ئاخرشەهیدێک شکاتی هەیە
عاشقێک دەیەوێت بلێت
ئەوان هەمووشتێکیان فەرموو
تەفسیرێک نەبێت بۆ ژیان
یان مەرگ بەڕوتی ....،

پایزی 1999
لیۆن

## بم بینە تا بتبینم

بۆ روخساری دووهەمی من
وەرەوە ژێربالّی چەترەکەم
بە گرِوگالّەوە تەرِدەبی کچەکەم دەخوسێ
بەو ئەسرینانەی
لە ئاسمانی شەرمەزاریمەوە دادەکەن
خنەخن وەرەوە ژێرکەپری هەناسەم
دەسوتێی کچەکەم داخ دەبیت
بەو پشکۆیانەی
لەزمانی غەریبیمەوە دەرژێن
گاگۆلّکێکانت لەسەر ئەو بانێژەیەکۆکەرەوە
کە من لەبری نازنازەکانی پێکەنین
چقلّەکانی بێنازیم بۆچاندیت
هەروەها نەفرەتکە لەو رەورەوەیەی
کە من بۆم چێکردبوی لە قورِقوشمەکانی بێهودەیی
من دەمگوت
دارەدارە ئیفلیج بەکچم پایزە
دارەدارە بکەوە کچم دۆرِانە
تۆ دەتگوت
دارەدارە بابە پێت توندکە زریانە
دارەدارە چەترەکەت هەلّدە بابەگیان واگریانە
من دەمگوت
ئێی کچی خۆم وەرەوە سەر ستونەکانی
فرِین، فرِین، فرِین
من دلّنیام رِۆژێک هەلّدەکوتێتە سەرمان
دەبێت بەبالّی کۆترە شینەکانو
نەورەسەکانی ئەوبەری دەریا بفرِیت
وەرەوە نێو حەوزەمەنەکانی قەدەر
من دلّنیام...... دلّنیا عەزیزم
رِۆژێک ئاگر دەکاتەوەو
رِەنگە لەگەلّ شەپۆلی خنکانەکاندا کۆچ بکەیت

تۆ دەتگوت
ناتۆ هیچت نەدەگوتو
پەنجەی  شایەتومانت دەمژیو
لەگەڵ ڕەوڕوەکەتدا دەکەوتیتە سەما
هێمنتر لە سەما.....
تۆهیچت نەدەگوتو
ئەوکاتەی  بەئینجانەی  ژورەکەمدا
هەڵدەزنایتو
قوڵ دەتڕوانیە بەژنی  گوڵە خوێنەکان
ئاااای  کە درەنگە ئەمشەویش
وا منداڵان
گەڕانەوە ناو باخچەو پەپولەکانی  بەهەشت
تۆش بەدیار یاسەمینەکانی  گومانەوە
کە ئێوارەیەکی  درەنگ
لایەلایەت بۆ بوکەشوشەکەت دەکردو
دەتگوت
ڕۆڵە لایلای  کورپەکەم لایلای
ڕۆڵە لایلای جەرگەکەم لایلای
من دەمگوت
ڕۆژێک دێت پەروانەکانی  سەرشانت
دەفڕنو
تۆ دەگریت تەڕمدەکەیت
دەمخوسێنی
دەمخوسێنی  بە ئەسرینەکانی  تەنهایی
لەبەر چاومە ئەو ڕۆژەی
لە باڵی  پەپولە چەترێکت چنیبوو
پێت گوتم
بابەگیان دەڵێن لەمەنفا
ژیان لەژێر چەترێکدا دەگوزەری
من ئەم چەترەت پێدەبەخشم
من کۆکەکۆک
دەستم درێژ کرد و نا لێم وەرنەگرتی

من دەمگوت
ئاخرکچی خۆم لەسوبحی  گولآند
پەروانەکان لەژوانی  عیشقەکانیان جێدەمێنن
تۆگوتت
نا تۆ هیچت نەگوت
چەترەکەت کردە سیبەری  وەنەوشەکان
لە بیرمە میرنشینێکت
لە پەڕەی  نازکی  شیلانەکان بۆ دروستکردبووم
بە شەرمێکەوە فەرموت
بابە تۆ پێویستیت بەژیان هەیە
ئەو هەرێمە ماڵی  تۆیە
ووتم ئاااااخ عەزیزم
پەروانەکانی  سەرشانت فڕینو
گوڵەکانت پێنەبەخشین
تۆگوتت بابەگیان پێناسەی  ژیانم بۆ بکە
من بەچاوی  تەڵخو سەروریشی غوباراوییەوە ووتم
ژیان ئەو
تۆگوتەکەت لێسەندمەوەو
وەکو ئەوەی  یادت گرتبێ
گوتت
ژیان لەژێر ئەوساباتەدا نوستووە
وانیە بابەگیان توخوا وانیە
من دەستە لەرزۆکەکانم بە ڕیشما دەگێڕاو
گوتم ئۆف ااااا ژیان
وتت بەڵێ
ئەگەر باوەڕناکەیت وەرە تەماشاکە
پەروانەکانیشی  لێن
من گوتم
ڕۆڵەگیان لە هەرکوێیەک
ئەم جەستە بۆگەنەی منی  لێ نەبوو ژیان لەوێیە
تۆگریایت و گریایت و گریایت
بە نوزەیەکەوە پێت وتم

کەواتە من لەگەڵ ژیاندا بەعزم
بە چەچە بچوکەکانت میرنشینەکەت گڕتێبەرداو
من گوتم
گرنگە بزانی  هەموشت پارچەیەکە
لە غوبار و پارچەیەکیشە لە ئاوابون
کچەکەم پێم گوتیت ڕۆژێک دێت
مانگیش بەلەشی  پیسەوە ئاوادەبێت
مرۆڤ دواین پارچەکانی  دۆڕانە دۆڕان
تۆ چاوە ڕەشەکانت لە چاوما تواندەوەو
بە ئەسەفەوە فەرموت
د
ۆ
ڕ
ا
ن
من شەقاوێکی  لەرزۆکم هەڵگرتو
مژم بەدوا نەفەسی  جگەرەکەمەوە ناو
بەدەنگی گەردەلولێکی  بریندارەوە گوتم
وەرەوە ژێر باڵی  چەترەکەم
تەڕدەبیت کچەکەم دەخوسێ
وەرەوە ژێر کەپری  هەناسەم
دەسوتێی  جەرگەکەم داخ دەبیت

بەهاری  /2000
فەرنسا

## ئافاتەکانی فڕین

تا لە سەلآی ئەم شیعرە ئاویانە دەبمەوە
هەندێک تریفە
لە هەناتوی مانگە تەنهاکانی
شان و ملم بخوازن
بۆ شەوانی کەرتبون دڵەکان
هێشتا عیشق
لەبەردەم تەلیسمی ئاوێنە مەجهولەکاندا
ڕوت نەبۆتەوە
هێشتا باخچە
بە بوخچە هەمەجێکەیەوە
لە فەسلچەکانی شنەوە نەهاتۆتەوە
بەم سوبحی سەحەرە
بەم فەسلّی میحنەتە
بەم یاخی بونی شۆڕەتە
دەنگمان
پۆترێتە مەحزونەکانمان
کوفرە جوانەکانی منالّی
خالّیکەنەوە
لەشوعلە مەغرورەکانی تەمەنمان
ئیدی دوور
لەکەنارەکانی دلّنیاییەوە
کوختێک بۆ شەرارە ئارامەکانی جاویدانیمان
هەلّدەبەستین
گەر ئێوارەیەکی پایز
بەخۆم و کراسە ئەلّوەنەکەمەوە
هارەم کردە بەر پەنجەرەی
ئیشتیهاقی خەونە چەپککراوەکانی

ن

ی

ش
ت
ی
م
ا
ن

ڕێگەم بدەن با لە وشەیەکی  ساردەوە
دەست پێبکەم
بۆڕاڤەکردنی  ئەو ڕیسالاٌنەی
بەناوی  عەشقەوە دەمان نوسیو
بۆ موراجەعەکردنی  حەرفە سەرەڕۆکانی  دەکوژراین
ڕێگەم بە بۆجارێک
لەنەزاهەتی  شوعلەوە دەست پێبکەم
تا لە خورپەی  دڵی  ئەو شاپۆراغە ساوایانە حالٌیبم
کە لەپێناو عیشقێکی  ئەزەلیدا
بۆ مەرگ دەشنێنەوە
ئەی  موریدە ئەفیونخۆرەکانی  نێو دلٌمان
وەرینی  من
وەرینی  دڵی  دەنکە گێلاسێکی  شەرمن بوو
بۆسەر سفرەی  سۆزانییەکی  پیر
کەوتنی  من
کەوتنی  حەرفێکی  سرک بوو لە وشەیەکی  ئەلٌماسیدا
مردنی  من ترازانی  شمشێرە نەعلەتیەکەی قابیل بوو
لەهەناوی  بەرائەتێکی  مەزندا..
ئەوەندە خۆر خەزن مەکەن
لەژورە شوشەییەکانی  باخچەدا
ئەوەندە لە گەورەبونەوە ڕامەمێنن
لە ئاسمانە موغلەقەکانی  پیری
ئەوەندەش بە یەئسەوە
مەگەڕێنەوە پیاسەی  ڕەزە تالاٌییەکانی  منالٌی
چون هەموان پارچەیەکی  لەعنەت کراوی  خواین
لەتۆفانی  گوناهەوە هاتوین

قامەتمان لەوەسفی  خۆڵەوە هاتووە
بۆ وەسفی  خۆڵیش دەگەڕێینەوە
لێرەم و هەمودەم
لە دەرگا داخراوەکانی  حوزنەوە
لە بانیژە سورپۆشەکانی  تەماشاوە هەڵدەکەم
وەلی  من بەدگومانم لەوەی
لە ڕەحمی  ئاوەوە هاتبم
بەد گومانم لەوەی  لەگەڵ میتەرەوانە قۆشمەچیەکاندا
نەکەوینە بۆسەی  پەیڤینێکی  سەرابی
ئۆه!!
بونی من دەرەنجامی  خۆکوشتنە
لە پێناو ڕازێکی  حەیوانیدا
بەربونەوەی  دۆژەنێکی  ڕوسیایە
لە دەستی  هەورێکی  نەزۆک
لەم دەریاچەوە
بێهودەیی باوکە نارسیزمەکانو
عەبەسیەتی  هاوڕێ ماسۆشیەکانم
دەبینم
دانەیان بۆژیان دەگرتەوەو
پەت پەتێنیان بەتەمەنیان دەکرد
ئەی لاولاوێک
دەتەوێت بەقامەتی  مردنیشما هەڵزنێی
گوناهی  من گەردیلەیەکی  بچوک بوو
لە مەعبەدێکی  چۆڵ
پەیڤینی من مومارەسەکردنی
ئەنگێزەیەکی  تراژیدی بوو
لە ئەوەڵەوە
ئەی  ئەو ڕوبارە تیژڕەوەی
نیازپاکیت لەوەی
شوێن جێ پێکانم هەڵگرتووی
بمکەیتە تونێلە تاریکەکانی  دۆزەخداو
ئاگری  حەشرم پێ خۆشکەیت

بونی من گوناهی گەورەبونی تۆ بوو لە ئەزەلەوە
هەڵەشەیی من
لەژێر ئاسمانە نسرمەکانی مناڵیدا
تۆوی خەجاڵەتی ئافاتەکانی فڕین بوو
فڕین بۆ مەغزا غوباراویەکانی حەقیقەت
فڕین لەنێوان ئاسۆکانی وەهمو
بەندەرە سواوەکانی عەدەمدا
من بەو شۆڕشگێڕە خڵەفاوە ئەبلەهە دەچم
کە عەشوائی
ڕوەو سەنگەرە تاڵەکان
گلێنە ساختەکانی خۆی پێچایەوە
بە لۆژیکی جەنگەوە
ناسنامە ئینسانیبونی دۆڕاند
قەدەرێکە
لەو وێستگە ناوزەد کراوەی
بە دورگە تەلیسماویەکانی خۆکوشتن
چاو بۆفڕینی ڕۆحم هەڵدەخەم
لەبەر ڕۆشنایی مردندا
ئەم جەستە گوناهبارەم
لە ئەفسانە شەرمەزارەکانی داپیرەم داشۆرم
بە نێو زۆزانە شەرمنەکانی عەشقدا
یەک تا یەک تا
هەمو پەپولە و گوڵ و ماچەکان
لە ڕوخساری ئیزدیواجیم بشۆنەوە
یادگاریە سەرمابردوەکانی هزرم
قەتارە دەبەستن‌و
لەنێو چەهچەهەی بوولبولە سەمەرەکاندا
دڵی ئەو قومرییە ئەیمەنیانە ئاسودەکەن
کە ڕۆژانێک لە شەرمدا
باڵەکانین بۆ نەسیمەکانیان بەجێهێشت
ئەی گوڵە پەژمودەکانی دیرۆکی هەڕاج
بەم درەنگ وەختە

له دەرگای چ شکۆفەیەک
ئەی تیتراوسکە پێکراوەکانی
ئاسمانە سوتماکەکەم بەدەمامک
بەم سەحەری کۆتاییە
فڕینە مۆمیاکراوەکانی
لەچ ئاسمانێکی بەردین دەوێت
تۆ ئەی مەلیحێکی هەتک کراوی
نێو میترۆکانی جەهل
بەم چێشتەنگاوی پایزە
پاکیزەی تکات
لەچ شاهەنشایەکی سەرخۆش دەوێت
منێک کە خوێسار ئەعزامی کۆنکرێت کردبێت
گلەیی لەچ بورج ناسێکی خەڵەفاو بکەم
بێمەئوا شەقامە غوروبەکانو
دالانەکانی نەنگیمان دەپشکنی
لەم ئاسمانی دۆڕانەوە
عەئشوائی پەیکەری سێبەرەکانمان
گرتە شوشەو
جاڕی فیراقی ڕۆحە مەئویسەکانماندا
سەفیە....بوین
له لەتکردنی لە تەسیۆەکرمێ بووەکانی ڕۆحمانو
لە چنینەوەی بەرسیلە وەریوەکانی ڕوئیامان
تارمایی وەک سوالکەرێکی کەنەفت
هاڕەی کردە بەرپەنجەرەی دڵە بچکۆلەکەی تۆش
(ڕوئیا) گیان
ئەوە فتیلەی ڕورەشی دیرۆکو
ئەمەش بەشێک لە ستایشی کوچە
خالّی لەم شەوانی شەرما
لەم داچۆڕانی نەزاهەتا
بەتۆش برا

هاوینی 1996
سلێمانی